ڕوونکردنەوەیەکی بچووک

نە بەڕێکەوت بوو نە بەنیازی پێداهەڵگوتن بوو کە ئەم کتێبەم ناو نا «حەماغای گەورە» ئێمە کە بگەڕێین بە دوا ڕاستییەکانی کیمیایی و فیزیایی ئەم جیهانەدا و هەر یەک لە دیاردەکانیان بە ناوێکی دروست و گونجاو لەگەڵ خۆیدا ناو بنێین، دەبێ لە ئاست ئادەمیزادا ڕاستگۆتر بین، چونکە فیزیا و کیمیاو فەلەک زەرەرێک ناکەن بە لێ کەم کردنەوەیان سوودیش وەرناگرن لە بەسەرەوە نانیان: ئەوەی زەرەر دەک لەو مامڵەتە نارەوایە لەگەڵ سروشتدا خۆمانین، چونکە بە ناولێنانی کەم و زیاد ئێمەی تێدا بەهەڵە دەچین. هەرچی مرۆڤە بە دالەنگاندنی ناوەکەی یاخود نازناوەکەی یەکسەر دووچاری ستەم و زەرەر دەبێت و ئەو ئەرکەی کە بەو ناوەی گەیاندووە لێی دەچێتە هیچە، ئنجا خۆشمان لە دوولاوە زەرەر دەکەین لایەکیان ئەوەیە کە بە سڕینەوەی مایەی شانازی لە ناوی تاکێک بایی نرخی ئەو شانازییە دەست بەتاڵ دەمێنینەوە. لای دووەمیان ئەوەیە کە بەو بێ ئینسافییە فێری بوختان و ساختە و هەڵبەستن دەبین، چونکە ڕەوادیتنی تاکە یەک ساختە دەرگایەبۆ ڕەوادیتنی هەر ساختەیەکی دیکە کە حەزی لێدەکەین ئیتر چ بە لێکەم کردنەوە بێت و چ بە لێزیاد کردن بێت.

ڕۆشنبیری کوردی سەردەم وەها لەبەر زمانی خۆش دێت هەڵدانەوە و ڕێزلێنان بۆ مرۆڤی نەدار و بێسامان و ڕووت و قووت بێت و ڕقی لە شۆرەتی پیاوانەی خاوەن سامان و دەسەڵات هەڵدەستێت. وەک دواتریش دەخوێنیتەوە حاڵ گەییشتە ئەو بارەی کە بەشێکی بەرچاوی ڕۆشنبیرە نەوباوەکانمان بە نووسینی بێ پێچوپەنا هەموو سەرۆک شۆڕشەکانی لێرە بەپێشەوەی کورد سەرکوت و تاوانبار دەکەن هەر چونکە لەبرسان نەمردبوون. ڕەنگە من لەو گەنجانە پتر حەز بەوە بکەم کە لە چینی هەژار و ڕەشوڕووتی کورددا قارەمانی وەها بدۆزمەوە لەسەری بنووسم، بەڵام هەرگیز ئەو تاوانە بە ئەستۆی خۆمەوە ناگرم بە ساختە قارەمانەتی دروست بکەم بۆ هەژار یاخود ساماندار.

حەماغای غەفووری کە لێرەدا لە بارەیەوە دەنووسم بە دوو نازناو هەڵدراوەتەوە:

1- حەماغای گەورە.

2- حەماغای کۆیێ.

وادیارە ئەو خەڵقەی لەسەردەمی حەماغا خۆیەوە بەو دوونازناوەی هەڵداوەتەوەنازناوی غەفووری بۆ قڵافەتی حەماغا بە بچووک زانیوە هەرنەبێ لەبەر ئەوەی کە حەماغا چەندەها جار لەو غەفووراغایە مەزنتر بووە کە بنەماڵەکەی پێدەناسرێتەوە. ڕاستێکەی زۆر کەسم دیتووە، حەماغا لە چ بنەماڵەیەک بووە هەر ئەوەندەی زانیوە کە بڵێ حەماغای کۆیێ یان حەماغای گەورە.

من کە هاتم نازناوی «گەورە» م هەڵبژارد بۆی لەو ڕووەوە بوو کە ئەمیان پتر لە «کۆیێ» پشکی تایبەتی خۆیەتی، چونکە هەزاران هەزار کەس بەشدارن لە کۆییاتی.

حەماغای گەورە

پێشدەستی

دوو ئاغای ماوە وەک بیستوومە ئەخبار

ئەميناغا و حەماغای ساحبی کار

ڕەحمەت لە گۆڕت حاجی قادر! چەند جوانمەردانە، بە دڵپاکی و دەست خاوێنییەوە ناوی مێرخاسان لە خانەی ڕێزو سۆزدا یاد دەکەیتەوە، بۆ ئەوانەی دوای خۆیشت لە دنیادا چاو هەڵدێنن ڕۆشنایی دەخەیتە سەر ڕاستیە بێفێڵ و بێ فاکوفیکەکان کە لە سەردەمی خۆتدا بە لای گەلەوە جێی نرخ و بایخ بوون، بەوەدا جارێکی دیکەش خەش لەبیبیلەی چاوی بینەران هەڵدەگرێت تا ئەگەر هیچ هێزی بینینیان تێدا بێ ئەبڵەق نەوەستن وەکوو چاوی کەروێشک کە زەق زەق نووستووە هیچ نابینێ.

حەمدی گوتەنی «بازاڕی دەهرە» کژلەکژو پشتاوپشت زەوقی کڕین و فرۆشتن دەگۆڕێ و کالای هەمەچەشنەی لەیەکدی نەکردوو جێگەی یەکتر دەگرنەوە، بابەتی دەساڵ لەمەوبەر بە کەلکی بازاڕی ئەمڕۆکە نایەت، وەهاش دەبێ بابەت لە حەفتەیەکدا عومری بەسەر دەچێت و کڕیاری نامێنێ. مرۆڤی ژیری حەقیقەتناس لە گۆڕانی زەوقی کڕیاران وەتەنگ نایە، بگرە ئەگەر پێی بکرێ خۆی هەوڵدەدا لە پێویستدا ئەو گۆڕانە ببێت، بەڵام هەروەک لە لایەن حەتمیبوونی گۆڕانی زەوقەوە ناشێ وەتەنگ بێین، هەروەهاش کاری ئەقڵ نییە بڕیار بدەین لەسەر خراپبوونی ئەو شتە چاکانەی دەوریان بەسەر دەچێت: فراژیبوونی منداڵ بۆ گەنجایەتی ئەوە ناگەیەنێ کە منداڵی و ساوایی قۆناغی ناپەسندن لە ژیانی مرۆڤدا دەنا دەبێ

گەنجایەتیش بەد بێ، بە دوا ئەوەدا کامڵیش بەد بێ. ئنجا پیریش بەد بێ، چونکە هەموویان بەسەر دەچن. بەو پێیە ئەگەر بەسەرچوونی شتان بکەینە بەڵگەی خراپبوونیان دەبێ بڵێین قۆناغی مردن لە هەموو قۆناغەکان پەسندترە، چونکە بەسەر چوونی بۆ نییە هیچ قۆناغی دیکەی بەدوادا نایێ. ڕاستییکەی نە بەردەوامبوون دەبێتە بەڵگەی پەسندایەتی نە بەسەرچوونیش دەبێتە بەڵگەی بەدایەتی، لەهەر قۆناغ و ڕۆژگار و بارێکدا بین بەپێی عەیارەی ئەو سەردەمەشت پەسند دەکرێ یان بە ناپەسند دەژمێردرێ، نموونەی بەدایەتی و پەسندایەتیش هەمیشە لە کۆمەڵدا بەرچاو و هەست پێکراو بووە، خەڵقەکەش بۆ بڕیاردان لەو پرسیارەدا نەدەچوونەوە بۆ فەلسەفەی جۆراجۆر، کە جارێ پەیداش نەبووبوون، تاکوو بزانین «بەد» چییە و «پەسند» چییە؟ تێکڕای خەڵق بە عەیارەی بێفێڵ و سەلمێنراوی سەردەمی خۆیان چاکە و خراپەیان هەڵدەکێشاو دەیانناسیەوە خۆ ئەگەر جوداوازی باوەڕی ئایینی و تێکەڵ بەو کێشەیە نەبایە دەتوانم بڵێم زۆربەی هەرە هەرە زۆری گەل لەسەر یەک عەیارەی چاکەو خراپە کۆ دەبوونەوە، ئنجا کە ئێمەی سەردەمی ئاسمانگەڕی و زەڕڕەقلاشی، کە هێندەی موفلیس لێی بێبەشین، دەبیەین بەر لەو هێندە سەدساڵەیە بابایەکی مێرخاس پەیدا ببوو خەڵقەکە لێی ڕازی بوون و مەردایەتییان باس دەکرد نابێ چاوی نارەزامەندییان لێ سوور بکەینەوە و ئێسک و پرووسکی گۆڕخانانیان بە قرچەقرچ بهێنین هەرچونکە تەوراتە سیاسییەکەی ئەمڕۆمان لەوجۆرە مێرخاسییە قەڵس دەبێ. خۆ ئەگەر هەڵپە و دڵگەرمی و خوێن کوڵان حەزمان بۆ لای کوشتییەک ببات تا چەنگاڵ لە بینە قاقەی گیر بکەین بۆ ئەوەی دەمار و قەفەبلوولی سوریچکی هەڵبڕینەوە و شۆڕشگێڕایەتی خۆمانی پێ ئیسیات بکەین چ حاجەت هەیە بە لێدانەوەی قەبری سێ سەد ساڵی. سوپاس بۆ خوێن کوڵان وا دەست و پەنجەکانمان لە خوێنی زیندووانی ئەم ڕۆژگارە وەها ئاڵ و خوێن لێتکاوە لە نەوەی نەوەشمان زیادە!!
ئەوەندەمان برا کوژی کردووە بایی ئەوە دەکات کە گەییشتینە قۆناغی

ئاسمانگەڕی ڕێچکەی سەفەری بەرەو مانگ و مریخ و زۆهرەمان بە بەند و باڵۆرەی ئەو کوشتارانە سوورهەڵگەڕێنین. حەیف نییە بۆ شۆڕشگێڕی ئاخە لێوەی سەدەی بیستەم ڕق و بوغزە پیرۆز و پڕشانازییەکەی لە مردووان خەسار بکات! چاکتر ئەوەیە ڕابووردووە ڕەجاڵەکەمان بدەینەوە بەو کەسانەی لەسەردەمی خۆیاندا خاوەنی بوون. ئەوانیش و سەردەمەکەشیان، ملیان وەقوتەوە، هەر چییەکی کردبێتیان و گوتبێتیان کار ناکاتە سەر ئاڵوێری بازاڕی سیاسەتی ئەم ڕۆژگارە هەرنەبێ لەبەر ئەوەی کە ڕابووردوومان تاریک و بێخەبەرە ئیتر بۆچی لابدەین لە کوشتنی ڕوح لەبەرێکی ناحەزی گەڕەکی کاولۆکانی ڕەواندز یان شێخەڵڵای هەولێر یان گۆیژەی سلێمانی لە پێناو دووبارە کردنەوەی مراندنی مردوویەکی سەد ساڵە !؟

ئنجا ئەگەر خوێنەری ئازیز گوێ بداتە ئەو دەنگانەی بێگۆڕین و باهەڵدانەوە و شێواندن، کە لە خۆوە بە لووس و باریکی بۆمان سەرەژێر بوونەتەوە و باس و خواستی بەسەر چووانمان بۆ دەگێڕنەوە، بێگومان، ئەویش وەکوو من و هەزارانی وەکوو من، حیکایەتی مێرخاسان و پیاوچاکان و جوانمەردان لەو دەنگانەوە وەردەگرێ، هی وەها خۆشیشیان لێبەدی دەکا کە هێندەی بەستەی بن بزێوکەی دڵداری بۆ بەر گوێی گەنجی خورت دەشلێتەوە. بەلای باوەڕی منەوە، کە وا دەزانم زانستی نەفسیش دەیسەلمێنێ کەسێک لە باسی پیاوەتی و جوانمەردیی دەسەڵاتدار وەتەنگ هات دییارە دەروونی نەخۆشە وەک ئەوەی کە تادار تامی هەنگوین لە زاریدا تاڵ خۆ دەنوێنێ لەوەدا هەنگوین چ گوناهی نییە خەڵقی دیکەش کە هەنگوین بەشیرن دەزانن چ گوناهیان نییە، خۆ نایەن بەربەیار بە گوژاڵی لەقەڵەم بدەن. ئەو کەسەی پێی ناخۆشە دەوڵەمەندێک یان دەسەڵاتدارێک یان شێخێکی تەریقەت یان سەرۆک عەشیرەتێک پیاوی چاک و لەخواترساو بووبێ هەر خۆی حەز دەکا کە موراجەعەی قائیممەقام یان پارێزگار یان وەزیرێکی کرد، حورمەتی بگرێت و ئیشەکەی بۆ ڕاپەڕێنێت وەیا هەرنەبێ بێقانوونی لەگەڵدا نەکات.

ئنجا ئەگەر بەچاکبوونی دەسەڵاتداری لێرە بە پێشەوە تەرازووی نەزەریە سیاسییەکەی دابلەنگێ خۆ بەچاکبوونی وەزیری سەردەمیش هەر دادەلەنگێ.

نەزەریی شۆڕشگێڕانە چ دەڵێ بابڵێ، لەڕاستیدا هەموو چاکە و دادێک لە درێژایی و پانایی ڕۆژگاردا بەسوودی هەژار و بێدەسەڵات تەواو بووە، هەرچی دەسەڵاتدارە، هەم خۆی پێدەپارێزێ هەم سوودمەندتریش دەبێ لەنەمانی دادوچاکە، خۆ ئەگەر تەماعی زیاد ئەو دەسەڵاتدارە دڕندانەی نەخستبایە سەر دووژمنایەتی نێوان خۆیان دەیانتوانی ستەمێکی دڵیان بۆی بچێ بە چەور و لووسی بیکەن یان هەر نەبێ ئاسانتر بۆیان دەکرا:

ئنجا برای خوێنەر سەیرێکی دڵ و دەروونی خۆت بکەو خورتەی هەناوت بە عەیارە دابنێ بۆ «رد فعل ـ بەرتەک»ی ئەو خەبەرەی کە لەبارەی دادخوازیی ومەردایەتیی دەرەبەگێک 200- 300 ساڵ لەمەوپێش بۆت باس دەکرێ تا ئەگەر خەبەرەکە بەلای تەبیاتتەوە تاڵ و تفت بوو خێرا بڕۆ لای پزیشکێکی نەفس و لێی مەگوێزەوە هەتا ئەو بیژۆکە دەمارەی هەناوت لە ڕەگەوە هەڵدەبڕێتەوە. تۆ ئەگەر ئەو نەخۆشییەی دەروونیت چارەسەر نەکەیت هەمیشە ئامادە دەبیت، لەبۆ بەرژەوەندی خۆت، با بدەیتەوە سەر دۆست و هاوڕێ و هاومەزهەب و هاوئامانجەکانت و تەپڵی تۆپانیان پێبکەیت و بۆیاغێکی درۆزنی «تاویل» لە کارەکەت هەڵسوویت و بیکەیت بە فەرمانی خەبات.. مێژوو.. چاکەی گەل.. چارەنووس..!!

چی لە خەرمانی ڕووداوەکانی ڕۆژگاری ڕابووردووە دێتە دەفرمانەوە و سوودی لێدەبینین ئەو ڕەفتار و کردار و گوفتار و بڕیارە چاکانەن کە کاتی خۆی گەل سوودی لێدیتوون و لێیان ڕازی بووە. زوڵمی زۆردار هەروەک لەسەردەمی خۆیدا زەرەربەخش بووە بۆ ئەم سەردەمەش چ سوودێک لە کوتانەوەی بەرهەم نایێ دڵی خۆمانی پێخۆش بکەین. هەندێک، بگرە هەموو تیژڕۆیەکان زۆر بەسەیری وەها دەزانن هەتا زوڵمی زۆردار بەزیادەوە بکرێ و هەتا خاوەن دەسەڵاتی لێرە بەپێشەوە ناوزڕاو بن دەماری شۆڕشگێڕایەتی لە

هەژاری ئەم سەردەمەدا کشتتر دەکات و پتر بەلای
نارەزامەندییەوەی دەبات و خێراتر کۆت و زنجیرەکانی پێ تێکدەشکێنێت..
ئەم جۆرە بۆچوونە هەر لەسەر ڕووی کاغەز و تەنها لەحاڵەتی وتوویژ لەگەڵ
خۆ کردندا بەڕاست وەردەگیرێ، هەر لێی بە دەنگ بێیت وەکوو بەفری
هاوین دەچێتەوە. بەر لەهەموو شتێک دەبێ بزانین، هەر ئامانجێک پێویستی
بە ساختەکاری و درۆ هەبوو ئەگەر لەئەنجامدا سەریش بکەوێ ناتوانێ خۆی
لە درۆو ساختە دەرباز بکات. هەروەک بەناوی «پێویست» دەشێ شۆڕەتی
عومەری عەبدولعەزیز بشێوێ هەروەهاش بە ناوی «پێویست»کاکە پۆلپۆت
بەڵایەکی بەسەر کەمبۆدجیەی ڕزگار کراودا هێنا حیکایەتی «سەدرەحمەت
لە کفندزی کۆن»ی بە بیراندا هێنایەوە. شۆڕشی سەقافی چین پەڵەیەکی
وەها ڕەشی لە ڕووپەڕەی تازەی مێژووی چین چەسپاند نە بە ئاو
دەشووریتەوە نە بە گازر دەسرێتەوە. لەمەش بترازێ مافی گەلان و فکرەی
داد و ڕاستی و جوانی و ڕەوایی خۆی لە خۆیدا وەها گەش و بەهێز و نازدارە
هێندەش لە بەرژەوەندی ئادەمزاد ڕەگ داکوتاوە پێی ناوێ لەلاوە سووراوو
سپیاوی بۆ بخوازرێتەوە و لە جیاتی «کل تێکردن کوێر بکرێ ».

دەڵێن کابرای فارس دۆڵمەی گەڵا مێویان بۆ دانا، ئەویش سەیرێکی کرد و
گوتی: «اگرحیله نداری چرا لفلف می کنی ؟» واتە ئەگەر بەفێڵ نیت ئەو
خۆداپێچانە بۆچی ؟ دۆڵمەکەی نەخوارد. من وەکوو کابرای فارس دۆڵمە
بەلاوە نانێم، چونکە دەزانم گەڵا پێچراوەکانی بەشێکی پێکهێنەری
خواردنەکەیە، بەڵام زراندنی ناوی عومەری عەبدولعەزیز هەرگیز نابێتە
تێوەرپێچانی گەڵامێو لە برنج و قیمەی دۆڵمەی مێژوو ئەو مێژووە نەدەبوو
کە دەیزانین ئەگەر لەتەک یەزیددا عومەرێک نەبوایە وەیان لە ئاست
ستالین تیتۆیەک هەڵنەکەوتایە. بەداخەوە زۆربەی هەرە هەرە زۆری
کۆمەڵایەتی کۆن و گەلێک لە کۆمەڵانی سەردەمیش کە بریتی بوون لە
هەژاری ڕەنجدەر و کاسبکاری بچووک، نە تاک تاکی و نە تێکڕایی، دەیتوانی
بەرگری لە زوڵم و زۆر بکا، لەوە هەر بگەڕێ کە بەشێکی بەرچاوی ئەو

بابەت و کارانەی ئەمڕۆکە ناوی زوڵمی لێدەندرێ لەو سەردەمە کۆنانەدا بەلای خەڵقەوە جێی نارەزامەندی نەبووە هەتا لێ هەڵگەرانەوەی مومکین بووبێ، تاکێکی بێدەسەڵاتی ئەو سەردەمانە کە بە تەنها هیچی پێنەدەکرا، جارێ چ فەلسەفە و تەبلیغاتی بەرەو شۆڕشیشی نەبیستبوو کە بیهاوێتە سەر باری بیرکردنەوە لە پێکهێنانی حیزبی سیاسی بۆ بەرگری کردن لەو زوڵمەی لێی دەکرێ، خۆ ئەوەی ڕاستی بێ هەژاری ئەم سەردەمەش بیر لە دروست کردنی حیزب ناکاتەوە ئەگەر مامۆستا و ڕابەر و هاندەر بۆی ساز نەدەن و بە دەرسدان بەرەو نارەزایی و هەڵگەڕاندوەیەوە نەبەن. لەبەر ئەمە هەژار و بێدەسەڵات بەغەیری یاسا و دادگا و داب و دەستوور و نەریتی سەردەمی خۆی، چ پەنای شک نەدەبرد، خۆی بۆ هەڵکوتێ و ئومێدێکی پارێزگاری و ماف وەرگرتنی لێبکات. ئنجا ئەگەر لەکەرەمی خواوە یان لە هەڵکەوتی بەختەوەردا دەسەڵاتدارێکی لەخودا ترساو یان دادپرسێکی بەویژدان پەیدا بایە دەبووە هۆی حەسانەوەی ئەو بێدەسەڵاتانەی لەخشەی پووشکە دەترسان. لەساڵی قاتوقڕی و گرانی ئەگەر دەوڵەمەندێکی بەخشندە چەند برسییەکی تێر بکردایە بایی نرخ و بایەخی ئەو چەند گیانە لە تەووژمی ڕەوڕەوەی مێژووی زیاد دەکرد، چونکە لەبرسان مردن، ئەوسا، کەسی نەدەکردە شۆڕشگێڕ مێژووش هەر بەسەر شانی ئەو کەسانەوە دەبزووت کە نەمردبوون. ئەگەر زوڵم و برسییەتی هۆی شۆڕشگێڕایەتی بایە دەبوو لە ماوەی شەش هەزار ساڵی پڕ لە زوڵم و برسییەتی سەدان شۆڕشی سەرکەوتوو ڕەگی زۆردار و خوێنمژی هەڵبڕیبایەوە. لە ساڵی 1917 ز. پتر لەنیوەی دانیشتووانی کوردستان لەبرسان و لەسەفەر بەر مردن کەسیش لەو برسی و ستەم لێکراوانە نەک شۆڕشی نەکرد دەستیشی درێژ نەکرد بۆ نانی تێروتەسەڵەکان و بە دڵی زابتەکانیشیان لە جەنگ هەڵدەوەران.

لە مەیدانی ناسینەوەی نرخی بیژۆک و پەسندی کۆمەڵایەتیدا دەتوانین عەیارەی لە چەشنی تەرازووی شەش دەستە و پەنجا دەستە و پتر دەستەش لە کار بهێنین و نرخەکانیان پێهەڵکێشین.

من لێرەدا چەند دەستەیەکی ئەو عەیارەیە بە نموونە هێنانەوە پڕ دەکەمەوە:

1- دەزانین فەلاح لەکوردستاندا لە ناچارییەوە خووی بە نەریتی «شیربایی - واتە شیر بەهایی، نرخی شیر» گرتبوو تا ئەوەی خاوەن کچی عازەب ئەگەر بەهای خوێن وەیا بن پشکی ئەو مێیینەی نەدرابایە بەشووی نەدەدا. هەر ئەم نەریتەش بوو وەهای دەکرد کە کچ شووکردنی دەوەخرا ڕەدوو بکەوێ و دواتر مەسلەتی لەسەر بکرێ. توجاری شار، یان کاسبکاری عادەتی چونکە حاڵ و باری باشتر بوو لە هی فەلاح کچی بەشوو دابێ و نەیفرۆشتبێ بایی حەسانەوەی ئەو مێیینەو لە کیسە مانەوەی ڕەدوو کەوتن و نیزاع و مەسلەتی بەو مامڵەتە مەردانەیە، هەستی ئارامی لە دەروونمدا دەبووژێتەوە و قەتیش دڵشکەستە نابم بەوەدا کە دەستوورێکی ڕەگ داکوتاوی ئابووری «کچ بەپارە فرۆشتن» بەو مەردایەتییە دەپووچێتەوە. هەروەها کە بیستم توجارێکی شار کچی خۆی فرۆشت پەرۆش بۆ ئەو مێیینە ئادەمییە دەخۆم چ خۆشیشم بەدڵدا نایەت لەوەدا کە بەم مامڵەتە نامەردانەیە توجاری خوێنمژ ئیسپاتی بێویژدانی خۆی کرد.

2- مەعلوومە بەشێکی پارەداری شار کە جووتە هەستی لەیەکدی جودای تەماعی سوودپەرەستی و ترسی قیامەت دەیانهاوێتە سەرباری قیلەشەرعان و لە ڕێی « ڕەهن وەرگرتن و بەکرێ دانەوە » قازانجی 30% یا زیاتر لە کابرای قەرزوەرگر دەستێنن هی وەهاش هەیە دوای چوونە حەج دلێرانەتر ڕیبای بێتەئویل دەخوات. ئنجا ئەگەر زانیم پارەدارێک ڕازی بوو بە قازانجی 5% و 6% سەد جاران ئافەرین لەویژدانی دەکەم و بۆ قەرزدارەکەش دەگەشێمەوە کە ئەرکی پشتشکێنی لەومامڵەتەدا لە کۆڵ بۆتەوە پڕ بە دڵیش ئاوات دەخوازم کە هەرچی سوودخۆری ڕووی زەوی هەیە ئەو جۆرە ئینسافە بەکار بهێنێ، شاڵڵا سەدویەک دەستووری مادی و ئابووری و نەفسی و ئەخلاقی بەو ئینسافە دەپووچایەوە. نابێ مرۆڤایەتی خۆشامەدی لە سەرکەوتنی تەماع بەسەر ئینسافدا بکات هەر چونکە نەزەریە هەیە کار و بازاڕی خۆی بە بنگەی زاڵبوونی تەماع و بەرژەوەندی مادییەوە بەستۆتەوە.

3- بیستوومانە و دیتووشمانە هەژاری و تەنگەتاو بوون لەباری نالەباردا خەڵق دەخاتە سەر ڕاڕەوی ئەوتۆ کە ئاکاری مەردانەی لێ ڕازی نابێ. لە نموونەدا قسە لە مامۆستا هێمن دەگێڕمەوە بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست.
هێمن گوتی: باوکم سالآنە لە ڕۆژێکی مەعلوومدا دەچوە سەرقەبری مردوویەکی بێناو و نیشان لەو دێیەی تێیدا دەژیاین. لەباوکم پرسی، بۆچی وەها پێتەوە دیارە لە سەردانی ئەو قەبرە هەر دەڵێی دەچێتە حەج ؟
حیکایەتی بۆ گێڕامەوە و گوتی: ڕۆڵە لە ساڵی 1916ز. کە سپای ڕووسان وررووژمی هێنا بۆ ئەم مەڵبەندە ڕۆژێکیان لە غافڵی بەسەر دێیەکەمانی دادا. کوشتن و برین و فەسادکردن وەها بوو نەگێڕدرێتەوە. بەچاوی خۆم دیتم لەو شوێنی ئەو قەبرەی سالآنە زیارەتی دەکەم دەستەیەکی ساڵدات (عەسکەری ڕووس ساڵداتی پێدەگوترا، لە ڕیشەدا لەگەڵ سۆجەری ئینگلیزی یەک دەگرنەوە) کچێکی جوانیان گرت و ویستیان لێی بەنیاز بگەن ئەویش وەکوو ئاگر بەر بووە گیانیان. دەیانخست و هەڵدەستایەوە. کە لێی بێئومید بوون و زانیان خۆ بە دەستەوە نادات پارچەیان کرد. (دیارە زانیویانە خەریکبوون بەو کچەوە ڕاوی کچی دیکەیان لەکیس دەدات. م. م). منیش وەکوو خەڵقی دیکە هەڵاتم. ڕێکەوت وەهابوو چەند کەسێک لەژن و پیاو خۆمان لەئاشێکی نابەرچاو حەشاردا، فەوجێکی ڕووسەکان لەو نزیکەوە ڕەت بوون.
سوارەیەکیان بەلامانەوە هات و دۆزینیەوە. کچێکی جوانکیلەی ڕاکێشا بۆ پەنایەک. کچە هاواری دەکرد مامە بمگەیێ، مام لە ناو خەڵقەکە هەر ئەوەندەی پێکرا بڵێ: کیژم هیچم پێناکرێ. ساڵداتەکە دوای دابینبوون گەڕایەوە بۆ فەوجەکەی. ئنجا ڕۆڵەکەم من ئەمەیانم دیت و ئەو کچەشم دیت چۆن لەسەر naموس شەقوپەق کرا. حیکایەتی هێمن لێرەدا تەواو دەبێ.
بێگومان ناچاری هەموو عەیبێکی بەبەرەوە هەیە، بەڵام منیش و تۆیش حەز دەکەین مەردایەتی بگاتە ئەو پلەیە کە نامووس بە قوربانی ناچاری نەکات. ئنجا ئەگەر ویستمان عوزری سەدکەسی ناچار لە خۆ بەدەستەوە دانەوە بسەلمێنین دەبێ گۆشەیەکی دڵ و هۆشمان بۆ ئەو ڕێکەوتە خۆشەش

تەرخان بکەین کە مرۆڤ هەیە سەر بۆ ناچاری دانانوێنێ، ناشێ لەو تەرزە مرۆڤە توورە ببین کە مەردایەتیەکەی لە ڕادەیەکدایە ڕاستە حیسابی بڕیاری ناچاریمان لێ تێک دەدات یان عەیبی خۆمانی پێ بەدیار دەکەوێ.

4- بەعادەت فەلاح کە ڕەنجبەرێکی ڕاگرت وەهای دەچەوسێنێتەوە هەر دەڵێی گرۆی لەگەڵ خۆیدا کردووە دوایین دڵۆپی هێزوتوانای ئەو ڕەنجبەرە بەکاری سەخت و بەردەوام هەڵگوشێ لە بری ئەو شەرتەی «شەرت: کرێ» پێی دەدات و ئەو ماشێنەیەی سبەینان، بەرەبەیان، هەڵی دەقوڕێنێ. ئەمە دەزانم، بەڵام تا بڵێی حەزدەکەم فەلاحی وەها هەبووبێ زەلیلگیری لەگەڵ ڕەنجبەرەکەیدا نەکردبێ و بە چاوی ڕەحمەوە تێی ڕوانی بێ. مرۆڤایەتی هەرگیز زەرەر لە جوانمەردی و لێبووردوویی و باخەڵفەڕاحی و چاوپۆشی ناکات هەرچەند ئەو ئاکارانەش لەبەر چەژی ئەو کەسانەی بەپێی دەقی نەزەریەیان چاوەنۆڕی دڕەندەیی و خوێنمژین لە دەسەڵاتدارەوە، ئاکارەکان تاڵ خۆ دەنوێنن. چەند خۆشە هەموو ساتێک نەزەریەی ڕەشبین بەکاری مەردانەی ئەو خەڵقە سپیپات بپێتەوە.

5- من بەتەمانیم، بەتەماش نەبووم، کاربەدەست لە خۆوە دڵسۆزانە ڕەفتار بکا لەگەڵ موراجەعەچیدا، بۆیە سەر بە دایەرەیەکدا ناگرم کە کاربەدەستەکەی ناسیاوم نەبێ یان بۆم ڕانەسپێردرابێ. بەڵام لەمووژدەی خۆش خۆشترە کە بزانم کاربەدەستێک ژوورەکەی و دڵەکەی بۆ ئەو بێچارە و بێدەسەڵاتانە کردۆتەوە کە بەعادەت لەهەر هەنگاوێکدا، لەم ژوور بۆ ئەو ژووری دایەرەکان، نوقورچێکی بێحورمەتی بە قەپەرەی مرۆڤایەتییان دەکەوێ.

6- چ قەیدێ دەکا بزانین فڵانە شێخ و فیسار مەلا و ئەو تەرزە پیاوانەی لە کۆمەڵدا حیساب بۆ کەسایەتییان کراوە لەترسی خوایا لەپاکی خۆیانەوە ڕێی ڕاستیان بە خەڵق نیشان دابێ؟ کێ زەرەری دەکرد ئەگەر سەرەک وەزیرانی سوڵتانێکی بەرلە 200 ساڵ بەرتیل خۆر نەبووبێت؟ بۆچی دڵشکستە ببین

بەوەدا بگوترێ سەرەک عەشیرەتی قاشقای کە لەسەر بەرماڵ دوای نوێژی خەفتنان بەرەو قیبلە لە خوا دەپاڕایەوە مەبەستی هەڵخەڵەتاندنی دەوروبەری خۆی نەبوو؟ گۆیا ئەگەر ژمارەی قۆڵبڕان بە فێڵبازیەتی ئەو سەرەک عەشیرەتە یەکێک زیاد بکات بە چ ئامانج دەگەین؟ یاخود بەوەدا ژمارەی درۆزنان لەهەزارەوە بوو بە هەزارو یەک ئەنجا چی؟ لەبارێکی دیکەشەوە ئەگەر ڕاستگۆ لەژمارەی بیستەوە ببن بەبیستویەک کام پێچکەی ڕەورەوەی مێژوو پەنچەر دەبێ؟ دەک بە زیادم نەکردی مێژووی ئاشقە درۆ!!

من ئەو تێبینانە دەنووسم، دەشتوانم زۆریان لێبەردەوام بم، نەک لە بادی هەواوەیە، یان زەحمەتی بێلزومە. نووسینم دیتووە لەبەرەی شۆڕشگێڕی کورد هەرچی شۆڕشی کورد هەیە تاوانبار دەکات، چونکە سەرۆکەکانیان عەمەلە و فەلاح نەبوون، ئیتر بەدرخان پاشا و شێخ سەعید و قازی محەممەد و شێخ مەحموود و هەرچی سەرەک شۆڕشی کورد هەیە دوژمن بە میللەتەکەیان بوون.

نا، نا، کاکی شۆڕشگێڕ! جیهانی ئادەمزاد بە عەیارەی وەها سەرەوبن پێوانە و کێشانەی لەگەڵدا ناکرێ. هیچ میللەتێک نییە لە ڕووی زەمین تا ئەم دونیایە نەهات دەوڵەتەکەی خۆی هەڵوەشێنێ و نیری بەندایەتی بێگانە سەرلەنوێ بخاتەوە ئەستۆی خۆی، چونکە سەرۆکی شۆڕشەکەی یان دروستکەری دەوڵەتەکەی هەژارێک نەبوو، بەڵکوو بەگزادە یان سەگزادەیەک بوو. کام میللەتی لێی دەگرێت شانازی بە کۆنایەتی دەوڵەتەکەی دەکات و بە بەڵگەی سەربەرزی و گەردەن کێلی مێژوویی خۆی لەقەڵەم دەدات تا ئەگەر میللەتێک لە مێژوویدا پەنجا مەلیک هاتبێ پتر شانازی دەکات لەو میللەتەی چل مەلیکی هەبووبێ. خۆ لەسایەی ڕابووردووی ڕووت و ڕەجاڵی دوو هەزارو شەشسەد ساڵیمانەوە ئێمە تاکەیەک مەلێکیشمان نەبووە، خۆشی لە خۆمان!!

بە ڕاستی ئەمەیە ڕووپەڕەی سپی و بێگەرد کە دەفتەری مێژووی کورد دەیخوێنێتەوە. هەرگیز دەستەندایەکمان نەبوو پێی بگوترێ حکومەت. نە

میرزادە و نە بەگزادە و نە عەمەلەزادە و نە هیچ زادەیەک تاجە چڵکنە چەپەڵە پیسەکەی حوکمڕانی کوردستانی لەسەر نەنا. وای کە ڕابووردوویەکی ساغ و سەلیممان هەیە.

لە کوێ تاقمی چەپڵەڕێزان و شاباش بخوازینەوە زەماوەندێکی خاوێنایەتی و بێگەردایەتی و موفلیسایەتی و ڕەنجەڕۆیەتی 26 سەدەییمان بۆ بگێڕێ!!

«ئەی یاری عەزیزم بەخودا هەڵخەڵەتاوی»

بەڵام چ فایدە! نە بەمن و نە بەئەژدەهای پشت کێوی قافیش دەکرێ دەماری پێچەڵپێچی بەناخدا چووی هەڵخەڵەتانت لە بیخەوە دەرکێشێ مەگەر تەجرەبەی ساڵەهای بێبڕانەوەی کوێرەوەریت و دەست بەتاڵیت چاویلکەی بە هەڵەبەری سەرسوڕکێی نەزەریانت وردوخاش بکات، ئنجا بزانیت کە لەوەتەی میللەتت پێی ناوەتە کۆڕی سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەر لە 2600 ساڵ، دروێنە لە بیابانی کاکی بە کاکی دەکات. ئەگەر «کۆڕش»ی دووڕڕەگەی هەخامەنشی کورد دەبوو گورگەشین کەری مەلای نەدەخوارد.

ئەو ڕۆژەی هەخامەنشی بە ڕابەرایەتی کۆڕش گرەوی لە «ماد» بردەوە گلۆرەمان کەوتە لێژی. وەی کاشکی خوێنمژێکی ناپەسندی مەلعوونی بێحەیا و بێشەرم مادەکانی زاڵ دەکرد بەسەر هەخامەنشییەکاندا ئنجا باقوڕی دنیامان بەسەر خۆماندا بکردایە بۆ ئەو ڕووداوە شەرمهێنەوەی بە سفتوسۆیەی جەرگبڕەی شەیتان پەرستانەی کە کوردی لە شەق و لەقەی بێگانە ئازاد دەکرد. وەی هەزار هەزاران کاشکی و خۆزگە و دەستی شکاوم!!

من یان یەکێکی وەکوو من کە خەریک دەبێ تروسکەیەکی زێدەکزی ئاساری پیاوەتی لە حاڵ و باری دالەنگاوی کورددا گەش دەکاتەوە بۆ بەرچاوی بینەری کورد حەزی دەکرد لە دەفتەری مێژووماندا ڕووپەڕەی وەکوو داستانی پەڕینەوەی «طارق کوڕی زیاد» بۆ بەری ئیسپانیا هەڵداتەوە نەک هەر خەریک بێ بەترس و لەرزی نارەزامەندی تازە خوێنەواری کورد ئابڕووی ئابڕووداره‌کانمان لە مێرخاسە بەسەرچوەکانمان بپارێزێ. حەزم

دەکرد نەک هەر یەک «ئۆناسیس» بەڵکوو هەزاری وەکوو ئەومان لە خوێنمژی جیهانی هەبێ کەشتییەکانیان بە سەرگرانیەوە نەوت و کاڵای میللەتانیان لە بەندەری ئۆدێسای ڕووسەوە بۆ نیویۆرکی ئەمەریکا بگوێستایەوە… تامەزرۆم، بمخوێندایەوە لەجیاتی ئەوەی سپای نادر شای ئەفشار وڵاتەکەمان پێشێل بکات سپای کورد ڕاو و تەراتێنەی لە دەوروبەری ئەسفەهان و تاران بکردایە. کاشکی مێژووی ئێمەش وەکوو هی میللەتانی دیکە ڕووڕەش بوایە بەکاری دەسەڵاتدارانە و لەخۆبایی بووانە.

ئەگەر شوێنپێ لەڕووی زەوی نەسڕابایەوە، هەموو بستێکی خاکی کوردستان مۆرکی چەندین شوێنی چوارپەلی ئەسپی ڕاوڕووتکەری بێگانەی لێنەقش بەستوو دەبوو، وەی کاشکی لە جیاتی ئەوەی کورد خەریک بایە بە خۆ ڕزگارکردن لە ڕەوی سۆجەر و لیڤی ئینگلیز، لەندەن ناچار بایە دەست بە هەواوە پێشوازی لەسپای کوردان بکردایە… چەند خۆش دەبوو بە درێژایی سێسەد ساڵ والی ئیزمیر و ئەندرنە و ئەنقەرە کوردی کڵاشخواری شارەزوور بوایە، ئەدی ئێمە ناڵێین میللەتان یەکسانن؟

ئیتر بۆ دەبێ ڕووڕەش بوون لە دەستدرێژی و تەماعکاری هەر بۆ والی تورکان بێ، چ قەیدی دەکرد 200 - 300 ڕووڕەشی کوردیش والی بوونایە لەو دنیایە پان و بەرینەدا!! بۆچی کەیفم بەوە بێت کچی کورد لە پێناوی حەیاپارێزی خۆی هەڵاتووە یان خۆی بەکوشت داوە؟ بۆچی هەلی شەرەفپارێزی نەدەم بەکچی فارسیش لە دەست بێحەیایەکی کورد؟ چما کورد لەناو مەلاندا حاجی لەکلەکە لە دوورەوە بە حەیا و شەرمەکەیدا بناسرێتەوە؟ ئایا لە جیاتی دەست سووربوون وەها باشە مل هەڵبڕاو و ورگ هەڵدڕاو و ناموس دازڕاو بین؟ هەڵبەت من نامەوێ خوێن لە لووتی هیچ کەسێک بێت، بەڵام من موناقەشەی ئەو بەهەڵەدا چووەی کورد دەکەم کە ناوی شۆڕشگێڕە زلەکانمان دەزڕێنن هەر چونکە لەبرسان نەمردبوون. ئایا لەبرسان مردووەکە هیچی پێدەکرا؟ ئێستاکەش هیچی پێدەکرێ؟ بابڵێین ئەو سەرۆک شۆڕشانە نەیانزانی چۆناوچۆنی شۆڕشگێڕی ڕاست و دروست بن،

خۆ ئەوان نەچووبوون تکا بکەن لە داگیرکەر تاکوو بە خێری خۆی بێتە کوردستان و هەلی شەرافەتی شۆڕش بۆ ئەو سەرۆکانە ساز بدات، لە کەسیش داوا ناکرێ دەبوو پترعاقڵ بێ لەوەی هەبوو. کە سەرۆکەکان نەیانزانی چۆن بکەن خۆ کەسی دیکە نەهاتە پێش بڵێ من زانای دەوران و ڕۆڵەی خەباتی پێشڕۆم تا ئەگەر یەکێک لەو سەرۆکانە ڕێی لێگرت بەستەمکاری لەقەڵەم بدەین. بە هەمەحاڵ قسە کۆتایی نایەت، منیش لەکورتی دەیبڕمەوە و دەڵێم سەر فروو دێنم بۆ ئەو شۆڕشگێڕانەی خۆیان کردە چرای ڕێی خەبات و پێیەوە سووتان، شەرەفیشیان لە مێژوو گەورەتر خۆ دەنوێنێ بەوەدا کە دەیانتوانی وەکوو ئیمامی حەسەن مەسلەتی لەگەڵ معاویەدا بکەن کەچی ڕێیماڵکاولییان گرتەبەر. ڕێزی بێپایانم هەیە بۆ ئەو دەسەڵاتدارانەی لێرە بەپێشەوە کە بەپێی سەردەمی خۆیان بایی توانا چاکەیان بۆ خەڵق بووە، هیچیش بەتەما نیم لە کەسیش ناسەلمێنم بۆ هەڵسەنگاندنی ڕەفتاریان عەیارەی خوازراوەیان لێ بەکار بهێندرێ. ئەوان کوڕی ڕۆژگاری خۆیان بوون و بۆ ئەو سەردەمە دەژیان، ئێمەش بۆ سەردەمی خۆمان، یان هەر نەبێ لەسەردەمی خۆمان دەژین. نە لێمان داوا دەکرێ نە پێشمان دەکرێ بەعەیارەی 200 ساڵ دوای ئیمڕۆکە ڕەفتار بکەین.

من لێرەدا خەریکم زاخاوی مێشکی خۆم بەیادی کەڵەمێردێکی وەکوو حەماغای غەفووری دەدەمەوە، ئەگەر پێم کرابایە فتیلە چرای هەموو پرشنگدارێکی کوردم لە دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات خۆش دەکرد تاکوو لە ڕۆشنایی ئەوانەوە ڕۆڵەی نەوباوی کورد بەرهەنگاوی خۆی باشتر بدیتایە، چونکە مرۆڤ بە شارەزابوون لە کەس و کاری خۆی بەڵەدتری حاڵی دنیا دەبێ.

کورتە باسێکی بنەماڵەی غەفووری

وەک کە لە هەموو بابەتێکی ئەوتۆیی کوردەواریدا دەڵێین لێرەشدا دەڵێمەوە، داخم ناچێ هەڵسوکەوتی غەفوورییان لە چ سەرچاوەیەکی نووسراودا نەپارێزراوە. چی لەبارەیانەوە زانرابێ هەر ئەوەیە کە بە سەر زمانانەوە لە پشتێکەوە بۆ پشتێک شۆڕ بۆتەوە کەوا بێگومان پشتاوپشت نەختێکی لێفەوتاوە و هێندێکیشی داستان تێکەڵ بووە. کە دەڵێم سەرچاوەی نووسراویان نییە، ئەوەم لەبیرە کە قەتلوعامەکەی غەفوورییان و بەرەی ماڵی عیساغا لە ساڵی 1237 ک. لە چوارینەیەکی باپیری باپیرم مەلا عەبدوڵڵای «واثق باللە» و لە دەسنووسێکی فارسی کە لە ساڵانی نیوەی یەکەمی حەفتاکاندا بۆ کۆڕی زانیاری کورد هات، باس کراوە بەڵام هەمووی لە چەند دێڕێکد. هەروەهاش دەشێ لە تۆمارخانە کۆنەکانی عوسمانلیدا باسی قەتلوعامەکەی ساڵی 1284ک. کرابێ ڕەنگە جگە لەمانەش، ئەگەر پەڕە شڕەکانی کاغەزی ڕەسمی ساڵانی نێوان 1250 و «1337 ک. کە دەکەوێتە بەرانبەر ساڵی 1918 ز. و حوکمی تورکەکان بەکۆتایی شەڕی یەکەم کۆتایی هات لە عێراق»چاویان پێدا بخشێندرێ وردە هەواڵێکی ئەو بنەماڵەیە لە کاری وەکوو ئیلتیزامی مەڕانە و ئیجارە گرتنی جۆگەی ئەمیری و وردە پێوەندییەکانی عادەتی نێوان حکوومەت و خەڵقدا سەروسۆراغێکیان وەگیر بکەوێ، بەڵام کاری ئەوتۆیی هێندێکی مومکین نییە، چونکە سجلاتی کۆن بە زۆری چوونەتەوە بۆ ئەستەنبۆڵ، ئەگەر نەفۆتابن، هێندێکشیان ڕەنگە بڵاوبووبنەوە لە دەفتەرخانەکانی مووسڵ و کەرکووک و بەغدادا بەپێی ڕاگەیشتنی دەسەڵاتی ئەو شوێنانە بەسەر کاروباری سنجەقی شەهرەزوور. هەرچی سجلاتی کۆیێ هەیە لەو ساڵانەی پڕ تەقڵ و شەقڵی شەڕی یەکەم و هەراکانی دوای ئحتلال وەهاتریش هەمووی پاماڵ بووە. گریمان لەو پشکنینەوەیەدا هەواڵێکیش دەست کەوت باوەڕ ناکەم هیچی ئەوتۆ لە تاریکایی دەور و ئێستاکەی من ئەو خۆهێنان و بردنە لە نێوان کۆیە و ئەستەنبۆڵ و بەغدا و کەرکووک و ڕانیەدا گەلێک بەولای مومکینەوەیە. لەبەر ئەمە بەناچاری

دەبێ پشت ببەستین بەو هەواڵ و باس و حیکایەتانەی دەماودەم هاتوونەتە خوارێ و ڕاست و ناراستییان تێدا کۆمەڵ بووە. هەتا دوای شەڕی دووەمیش لە غەفوورییان دوو کەس مابوون ئاگاداری ئەو تەرزە باسانە بوون، یەکێکیان سمایلاغای مەلا ئەحمەداغای سمایلاغا کە پیاوێکی ئەدیب و زمانزان و باخەبەر لە مێژوو بوو،گەلێک نووسینی کورتیلەی سەر بە بەیتێکی شیعر یان لەتیفەیەک یان وردە خەبەری لێ بەجێماوە، بەڵام هیچ یەکێک لەو نووسینانەی من دیتوومن یان بیستوومن باسی غەفووریانی تێدا نییە. ئەوەی دیکەیان واحیداغای مام سلێماناغا بوو.

کاتێ خۆی لەزاری ئەوەوە یەک دەفتەر لە خەبەراتی غەفوورییان نووسرابۆوە. من کە کەوتمە سەر نووسین لەبارەی حەماغاوە هەوڵی ئەو دەفتەرەم دا، چەندێکی بە دوایدا گەڕان نەدۆزرایەوە. ڕەنگە ڕۆژێک کە ئیشمان پێی نەما لەبەر دەستمان قووت بێتەوە بەڵام چاک بوو زەرەر لە نیوەی گەڕایەوە بەوەدا کە کەریماغای حاجی ئاوڕەحماناغای غەفووری کاتی خۆی گوێبیستی ناوەرۆکی ئەو دەفتەرە ببوو، بەشێکی لە بیرمابوو. لەسەر خوایشتی خۆم کاک حاجی محییەدین هەموو قسەکانی کەریماغای لەدەفتەرێکدا نووسییەوە و بۆی هەناردم، دواتر بە تەکلیفی من چاو بە دەفتەرەکەدا خشاندراوە و یەکێکی دیکەی نەختێک تەعدیل کراو هەر بە خەتی حاجی محییەدین بۆم نووسرایەوە و بوون بە دوو دەفتەر بەڵام یەک نرخ و یەک بایەخیان هەیە.

بەپێی قسەی دەماودەم کە لە ڕێی واحیداغاوە بە نیوەچڵی چۆتە ناودەفتەرەوە لە کۆنی کۆنەوە، بەر لەسەدان ساڵ، غەفوورییەکان لە قەلەمڕەوی قەیسەری ڕووسەوە هەڵدەقەنێن بەرەو کوردستانی ئێران. ژمارەیان 200 کەسێک بووە لەمانە 40 کەسیان پیاوی مەیدان دەبن. پەنا دەبەنە بەر شای ئێران تکای لێدەکەن لە جێگەیەک دایانبمەزرێنێ، شاش پێیان دەڵێ بۆ سەلامەتی دەوڵەت بە بڵاوی داتان دەمەزرێنم. پێی دەڵێنەوە بایی چەرمی مانگایەکمان زەوی بدەیێ بەسمانە بەیەکەوە تێیدا دەژین. خۆلاسە زەویەکی کەم

وەردەگرن و قەڵایەکی مەحکەمی لێ دروست دەکەن.
بە تێکهەڵکێشانی قەفەقەمیش لەکانیەکی بزرەوە بە جۆرێکی نهێنی ئاو بۆ ناو قەڵات ڕادەکێشن تا ئەگەر ئابلۆقەش بدرێن لە بێئاوی تەنگەتاو نەبن.
دەفتەر دەڵێ ئەو کۆمەڵە زیادی کرد و لەگەڵ دراوسێیان پێوەندییان بەست بەو شێوەیەی کە شا لێیان کەوتە مەترسییەوە. شا لێیان داوا دەکا بگوێزنەوە بۆ جێگایەکی دیکە ئەوان لە جیاتی سەلماندن دەکەونە قایمەکاری. شا لەشکرێکی قورسیان دەنێرێتە سەرێ و شەڕ لەنێوانیاندا دوو ساڵ بەردەوام دەبێ.

لەو 40 مێردە بەپێی دەفتەر 39 کەسیان شۆرەتی لەپ زێڕیان هەبووە تەنها یەکێکیان بە «لەپ زیو» ناسراوە دیارە دەستەوانەی ئەو لە زیو دروست کراوە.

کابرای لەپ زیو لە حەسوودی فەرقی نێوان زێڕ و زیو، لە ژێرەوە دۆستایەتی لەشکری ئێران دەکات و تێیان دەگەیەنێ ئاوی قەڵات بە قەفەبلوول لە فڵانە کانییەوە وەردەگیرێ. بەمەدا ئێرانیەکان ئاوەکە دەبەستن قەڵاتنشینەکان ناچار دەبن خۆ بەدەستەوە بدەن، بەڵام کابرای لەپ زیو لەبری خیانەتەکەی دەکوژن. لەو قەڵاتیيانە سێ کەسیان خۆیان دەرباز دەکەن:

1- ئاوڕەحماناغا

2- مەحمووداغا

3- کەریماغا.

ئەو سێیە بەرەو کوردستانی عێراق هەڵدێن و خۆ دەگەیەننە دێی «وەرتێ» و لێی نیشتەجێ دەبن.

بەپێی دەفتەرەکە تاقمی قەڵاتەکە لە ڕۆژی دروستکردنی قەڵاتەوە تا ڕۆژی لێقەومانیان 25 ساڵ بەسەر دەبەن.

ئاوڕەحماناغا دوای ماوەیەک لە وەرتێوە دەگوێزێتەوە بۆ دێی «ئەسپینداره» لە ناوچەی شەقڵاوە، مەحموداغاشیان دەڕوا بۆ گوندی «شەرەفان»ی لای وڵاتی مووسڵ. بەپێی دەفتەر نەوەی ئەو دوو برایە تا ئێستاکەش خۆیان بە خزمی غەفووریيان دەزانن، لەوان شێخ محەممەداغای ئەسپیندارە و کوڕەکەی، حاجی حەمید «کە لە هەولێر دەژیت»و جەباراغای سابراغای شەقڵاوە و عەبدوڵڵاغای شەرەفانیش «کە من خۆم دیتوومە و دەیناسم و لە ساڵی 1953 هەردوومان نائب بووین، لێم بیستووە خزمی غەفوورییانە» لە نەوەی مەحموداغای باس کراوە.

کەریماغای کە دەبێتە باپیرە گەورەی ئەو تیرەیەی لە کۆیێ بە غەفووی دەناسرێن لە وەرتێ دەمێنێتەوە و وەچە و نەوەی زۆر دەبن. ئەمانەش بێرە و بەوێدا بڵاو دەبنەوە، یەکێکیان کە ناوی غەفوور بووە لە تەئریخێکی نەزاندراودا دێتە کۆیێ. لە هەوەڵەوە دەبێتە شاگرد دەباغچی. تائێستاش جێگە هەیە لەو شوێنەی دەباغچی کۆیێ کەسابەتیان لێدەکرد ناوی غەفوورییانی لێ دێت. بەپێی دەفتەری دووەم غەفوور برایەکی «صالح» ناویشی لەگەڵدا دەبێ. پیاوێکی لاتەریکی تەبیات سەلامەتۆکە بووە خووی داوەتە کەسابەت و بەلای ئاغایدا نەچووە. ئەم ساڵحە باپیرە گەورەی ماڵی «مام خدر»ە کە بنەماڵەیەکی خاوەن دارایی و تیجارەت بوو لە کۆیێ ئەوانیش خۆیان بەخزمی غەفوورییان دەزانن، ئێستا لە لایەن داراییەوە باری بنەماڵەکە گۆڕاوە، چونکە دوای شۆڕشی 14ی تەمووز و داهاتنی یاسای ئیشتیراکی دەقی کۆنی شیرازەی کۆمەڵایەتی بە خێرایی و بە تێکڕایی لە گۆڕاندا بووە.

غەفووراغا بە دەسەڵات بووە و دیوەخانەی پێکەوە ناوە و دوو گەڕەکی بایزاغا و قەڵات ڕوو لەو دیوەخانەیە دەکەن. ئەم پەرەسەندنەی دەسەڵاتی غەفووری جێی نارەزامەندی حەوێزییەکان بووە کە لە کۆنترەوە خاوەن

دەسەڵات بوون لە کۆیێ، بەفری قەندی و هەواو کە دوو گەڕەکی دیکەی کۆیەن بۆ ئەوان دەمێنێتەوە. ئەم ڕکەبارییە دواتر کاری خۆی دەکات.

غەفووراغا سێ کوڕی لەپاش بەجێدەمێنێ:

1- ئاوڕەحماناغا، براگەورە بووە.

2- قادراغا.

3- کەریم ئاغا.

ناحەزی نێوان حەوێزییان و غەفوورییان سەر دەکێشێتەوە بۆ هێندێ کە حکوومەتی سەردەم بە دۆستایەتی حەوێزییان بکەوێتە دژایەتی لەگەڵ غەفوورییان. لە ڕێکەوتدا سەرۆکی حکوومەتی ئەوسا لەژووری خۆی و لە بەرچاوی براگەورەیەکی حەوێزییان بێحورمەتی لەگەڵ ئاوڕەحماناغای براگەورەی غەفوورییان دەکات. ئەویش لە تۆڵەی ئەوە کە بە تووڕەیی دەردەچێ کاغەزێکی ئیهانەتکارانە بۆ خێزانی کابرای سەرۆکی میری دەنێرێ و هەرا گەورە دەبێ و پیاوی غەفووری دەستی چیا دەگرن و دەبێتە شەڕیان لەگەڵ حکوومەت. هێزی یارمەتیدەر لەڕێی پژدەرەوە بۆ حکوومەت دێت هیچیان پێناکرێ و چەندێکی دەیانەوێ ئەو هەرایە چارەسەر بکرێت و بەهەموو جۆرە ئیقناعکردنێک خەریکی غەفوورییان دەبن سوودی نابێ. هەتا پیاوێکی گەورەی سەر بەحکوومەت دەچێتە ناو غەفوورییان، بەڵام بەر لەچوونی چوێلەکەیەکی زیندوو لە باغەڵی دەنێت. سوێند و تەڵاقیان بۆ دەخوات بەوەی کەوا هەتا ڕوح لەبەر ئەو بەدەنەدا بێ غەفووری چییان لەگەڵدا ناکرێ ئیتر بەوەدا ئەمین دەبن و دێنەوە ناو شار. کابراش چوێلەکەکە دەکوژێت و «گۆیا لە سوێندەکەی ڕەها بوو غەفوورییان دەگرن و دەیانکوژن. ئاوڕەحماناغا دەگرن و لێی داوا دەکەن پەشیمان ببێتەوە لەو کاغەزەی بۆماڵی سەرۆکی حکوومەتی ناردبوو، ئەو هەر ناوەرۆکی کاغەزەکە دووپات دەکاتەوە. گۆیا دوازدە پیاوی کەڵەمێردی غەفوورییان و دوو برای خۆی لەسەر سینگی سەردەبڕن پاشگەز نابێتەوە، ئاگری لەسەر سینگی

دەکەنەوە فایدەی نابێ دەیکوژن. قەتلوعامەکە لەحەد بەدەر دەبێ تا ئەوەی تەنها 5 منداڵی ساوا لە نێرینەی غەفوورییان بە دزیەوە لە نۆیینی ماڵی کاک شێخ ئەڵڵاو سەیدە گچکەڵە پەنا دەدرێن تا هەرا دەبڕێتەوە ئنجا دەربازیان دەکەن و بۆ لای مریدەکانیان دەنێرن لە باڵەکەتی. لە دەفتەری یەکەم ناوی ئەم پێنج منداڵە بەم جۆرەیە: خاڵداغا، قۆتاساغا، مەرواناغا، غەفووراغا، ساڵحاغا.

لە دەفتەری دووەم هەرنەبێ لەبەر ئەوەی کە غەفووری تێدایە ئەو غەفوورە خۆیەتی دەبێتە باوکی باپیری حەماغا. لە کۆتایی دەفتەری دووەمیش شەجەرەی غەفوورییان ئەو غەفوورەی تێدایە و لەوێشدا بە باوکی باپیری حەماغا دەناسرێ.

دەفتەرەکان باسی گەورەبوونی ئەو منداڵانە دەکەن و چۆن دەبنە سوارچاک و لە لەشکری پاشای کۆرە دەبنە شەڕکەر و ناو دەردەکەن. پاشا لە پاداشی ئەومەردایەتییەیان و لەسەر تەکلیفی خۆیان بۆ کۆیەیان دەنێرێتەوە و ملْک و ماڵ و دیوەخانەیان پێدەدرێتەوە. بەم جۆرە سەر لەنوێ دەبنەوە بە دەسەڵاتداری کۆیێ.

لە پێشەوە تێبینیەکی بچووک دەردەبڕم. وادەزانم باپیرەگەورەی بەرەی ماڵی مام خدر ئەو ساڵحەیە کە یەکێک بووە لەو پێنج منداڵە نەک ساڵحێک کە بەپێی دەفتەری دووەم لەگەڵ غەفووری یەکەم لە «وەرتێ»وە بۆ کۆیێ هاتووە. غەفووری یەکەم لە دەفتەری یەکەمدا، و قسەی دەماودەمیش بە تەنهایی هاتووە.

لێکدانەوەیەک

دەفتەرەکان کە جوداوازییەکی زۆرکەم و بێتەئسیریان تێدایە و لە کاکڵ و ناوەرۆکی داستانەکە یەکدی دەگرنەوە سەرگوزەشتێک دەگێڕنەوە دەماودەم هاتووە و کەم و زۆری تێکەوتووە بەڵام سەرجەمی داستانەکە لە پەراوێزێکی

فرەواندا بەبەریەوە هەیە ڕاست بێت. وەها چاک بوو پرسێک لەو دووبنەماڵەی ئەسپینداره و شەرەفان کرابایە داخۆ سەروسەدای ئەو داستانە لای ئەوان چۆنە، بەڵام بەمن ناکرێ بگەمە ئەو شوێنانە دەنگیشم ناگاتە لێزانەکانیان لەبەر ئەمە بەناچاری لەگەڵ ئەو خەبەراتەی ناو دەفتەرەکان لێکدانەوە و بەراووردکاری دەکەم ئنجا ئەگەر ئەم نووسینە بۆی هەڵکەوێ بڵاوببێتەوە دەشێ لەو دوو بنەماڵەوە تێبینی و ڕاستکردنەوە و عەیب بڕینی لەگەڵدا بکرێ.

ئەو قەڵاتە قاییمە و نازناوی «لەپ زێڕ» و زەوی بەقەدەر چەرمی مانگاو ئاوی بەقەفەقەمیش و شەڕ لەگەڵ شای ئێران و بەدەستەوەدانی قەڵات، هەمووی دەمانباتەوە بۆ حیکایەتی قەڵای دمدم. هەروەک بەڵگەیەک نییە ئەوە بسەپێنێ کە خەتی نەسەبی غەفووری و ئەسپیندارەیی و شەرەفانی بۆ قەڵانشینەکانی دمدم دەچێتەوە هیچ بەڵگەیەکیش لەبەردەستدا نییە پێچەوانەی ئەوە بەئیسپات بگەیەنێ. دوور نابینم ئەو سێ کەسە باسکراوە لەوانە بن خۆیان دەرباز کردبێ و بۆ دیوی کوردستانی عێراق هاتبن. وەک کە لێکدانەوە و بەراووردی مێژووی زانراوی غەفووریانیش لە دیوی عێراق ڕایدەگەیەنێ دەشێ ئەو مێژووە درێژەکێشانی ڕۆژگاری هەراکەی قەڵای دمدم بێ. قەڵای دمدم لەساڵی 1024ک. لەلایەن شاعەباسی گەورەوە وێران کراوە «عالم ارای عباسی». قەتلوعامی غەفووریانیش لەکۆیێ ساڵی 1237ک. ڕوویداوە. ماوەی نێوان ئەم دووساڵە بایی ئەوە دەکات غەفووریەکان بەینێک لە وەرتێ مابێتنەوە، بابڵێین 100 ساڵ، ئنجا یەکێکیان یان پتر لەیەکێکیان چووبێ بۆ کۆیێ. ئەویش لەماوەی 100 ساڵێکدا وەچە و نەوەی زۆر بووبن و دەسەڵاتیان پەیدا کردبێ هەتا وەزعیان سەری گەیاندبێ بەو کارەساتە. لەمەدا تەگەرە نییە، بەڵام لەوردیاتی حیکایەتەکە شتی ئەوتۆ هەیە دەبێ ڕاست بکرێتەوە.

مومکین نییە ئەو غەفوورە «یان هەر ناوێکی هەبووبێ» کە هاتە کۆیە و بوو بە دەباغچی هەر لە ڕۆژگاری خۆیدا وەها دەوڵەمەندو دەسەڵاتدار بووبێ کە

لە چوار گەڕەکی کۆیێ دووگەڕەکە هەرە گەورەکانی کەوتبێتە ژێر فەرمانیەوە.

ناسرانی بەشێک لە دووکانەکانی دەباغچییەکان بەناوی غەفووریيانەوە خۆی لەخۆیدا وەها ڕادەگەیەنێ کە ماوەیەکی درێژەدار لەو کەسبە خەریک بوون هەتا پێوەی ناسرابن، دیارە بە دەباغچییەتیش نابنە خاوەن دیوەخانە و دەسەڵات. لەمەش وازبهێنین، دەفتەرەکان خۆیان دەڵێن ئاوڕەحماناغای غەفووراغا کە براگەورەی غەفووریيان بووە دووبرا و دوازدە مێردی دیکەی غەفووری لەسەر سینگی سەربڕان، ئەم دوازدە مێردە دیارە برای نین، کە برای نەبن کوڕی ئەو غەفوورە نین کە باوکی ئاوڕەحماناغایە. جگە لەو دوازدە کەسە بەپێی حیکایەتی دەفتەرەکان و قسەی دەماودەمیش، خەڵقێکی دیکەی زۆریش لە غەفووریيان بەو قەتلوعامە کوژران، ئنجا پینج منداڵیشیان لێ ڕزگار بوون. جەماوەری هێندە بە ئەژمار بەرهەمی چەند پشتێکن نەک یەک و دوو کەواتە قەتلوعامەکە چەند پشتێک دوای جێگیربوونی غەفووری یەکەم «یان هەر ناوێکی هەبووبێ» لەکۆیێ ڕوویداوە.

با بدەینەوە بۆلای چەندوچۆنی حیکایەتی قۆتاس و مەروانان. گوتمان قەتلوعامەکە لە 1237ک. ڕوویداوە. پاشای کۆرەش لە 1253ک. کوژراوە. بەوپێیە لە نێوان قەتلوعامەکە و تێچوونی پاشای کۆرە تەنها 16 ساڵ هەیە. دابزانین ئەو شازدەساڵە بەشی چی دەکات؟ ئایا لەگەڵ دەقی خەبەری ناو دەفتەرەکە دەگونجێ؟

بەپێی درەختی نەسەبی، کە دەفتەرەکە بۆ هەموو غەفووریيانی تۆمار کردووە چ شوبهەش لە ڕاستبوونی ناکرێ، چونکە غەفووری هەموو ئەو تیرانەی تێدایە کە دەفتەرەکە باسیان دەکات، ئا ئەو درەختە نەسەبییە شەش کوڕان دیاری دەکات بۆ غەفووراغا: کەریماغا، عەبدوڵڵاغا «کاکەڵڵاغا» ئاوڕەحماناغا، برایم ئاغا، مەلادەروێش، عەلیاغا. لەمانە بۆ مەبەستی هەڵسەنگاندن کەریماغا وەردەگرین. بەپێی دەفتەرەکە کەریماغا حەمەداغای

لێ بەجێدەمێنێ، ئەویش دوو کوڕی بووە یەکیان مەحمووداغا ئەوی دیکە کەریماغا. ئەم مەحمووداغایە باوکی حەماغای گەورەیە کە لێرە خەریکین بەرەو باسیەوە بڕۆین. ئنجا ئەگەر بزانین کە حەماغای گەورە لە دەورووبەری 1255 هاتۆتە دونیا دەبێ بسەلمێنین لە 1237 ەوە تا 1255 غەفووراغا مرد کەریماغای لێبەجێما ئەویش مرد حەمەداغای لێبەجێما ئەویش مرد مەحمووداغا ما. مەحمووداغاش لە 1255 حەماغای بوو. ئەم هەموو زاوزێیە لەماوەی هەژدە ساڵاندا چۆن دەکرێ؟ ئەگەر غەفووراغا و کەریماغاش لە حیسابان دەربهاوێین دیسان دەمێننەوە حەمەداغا و مەحمووداغا لەو ماوەی وەها کورتدا ببن و پێبگەن تا ئەوەی مەحمووداغا کوڕیشی ببێ. ئەمە بەلایەکدا. لە لایەکی دیکەوە مەروان و قۆتاس و هاوڕێکانیان ببڕای ببڕای ناویان نییە لە شەجەرەی نەسەبی غەفوورییان لەو دەفتەرانەدا. لەسەر ژمارکردنی نێرینەی غەفوورییان هەر لە غەفووراغاوە هەتا ئەم ڕۆژانە ناوی هەموانی بردووە. دەرکەوتنی ناوی قۆتاس و گرووپەکەی بۆ ئەوەم دەبا کە ئەمانە هی دەورانی بەر لەو غەفووراغایەن کە لە سەردەمی کوڕەکانی ئەودا غەفووری قەتلوعام دەکرێن. ناوی قۆتاس و مەروان لە ناوچەی کۆیێ نەبیستراوە، یان هەر نەبێ دەمێکە ئەو ناوانە بزر بوون لەمەوە ڕێی تێدەچێ ناوەکان هی سەردەمی پێش هاتنیان بێ بۆ کۆیێ. بەهەمە حاڵ هیچ بەرهەڵستی لەوەدا لزوم نییە کە ناوەکان لە کۆنەوە هەبوون، بەڵام گێڕانەوەی دەماودەم بەرەژێری هێنابن بۆ سەردەمی قەتلوعامەکە تەنانەت دەفتەرەکان سێ نیوە دێڕی فۆلکلۆرییان تێدایە باسی ئەوە دەکەن کە لەسەر ئەمری پاشای ڕەواندز قۆتاس و هاوڕێکانی بۆ کۆیێ دێنەوە و دەبینن دیوەخانەیان لەلایەن یەکێکی دیکەوە داگیرکراوە بەخەنجەر پێی چۆل دەکەن:

خالّد و قۆتاس و مەروان

دەستیان دا خەنجەری دەبان

بە میر چۆل دەکەن دیوان

بەڵام وەکوو گوتم ئەو مێردانە هیچیان ناویان نییە لە درەختی نەسەبی غەفووریيان کە ئەو دەمەش دەگرێتەوە بە ئەمری پاشای ڕەواندز هاتنەوە بۆ کۆیێ. خۆ ئەگەر هاتنەوەیان بەفەرمانی پاشا بێ کابرای داگیرکەری دیوەخانەکەیان ناوێرێ بێفەرمانی بکات هەتا بە خەنجەر دەربکرێ.
نیوەدێڕی دووەم لە دەفتەری دووەم نووسراوە «دەست دەدەنە خەنجەری دەبان». نیوەدێڕەکە لە هەردوو وێنەدا لەنگە، وابزانم ڕاستییەکەی ئەمەیە: دەستیان دا تیغی دەبان یان شیری دەبان.

ئەم سێ نیوەدێڕە بێگومان هی سەردەمی کۆنتر دەگێڕێتەوە، خۆم لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکەمدا نەدیتووە پێشتر نەشم بیستبوو. ئنجا ئەگەر لەهیچ لایەکەوە سەرو سۆراغی بەیتی ئەوتۆیی لە حیکایەتی دیکەدا دەست نەکەوێ دەشێ گێڕانەوەی ڕووداوێک بێ سەر بە غەفووریيان لە ڕۆژگارێکی بەر لە هاتنییان بۆ کۆیی.

مێژووی قەتلوعامەکە کە دەچێتەوە بۆ ساڵی 1237 ک. لە دوو سەرچاوەوە دیاری کراوە، پێشتریش لە موناسەبەدا لەسەری دوواوم، لێرەدا بۆ ئەو خوێنەرانەی پێشتر باسی غەفووریيانیان نەبیستووە دووبارەی دەکەمەوە. سەرچاوەیەکیان ئەو دەسنووسە بەیازە فارسییەیە کە دەڵێ لە جەژنی ڕەمەزانی 1237 عەبدوڵڵا غەفوور بە خۆی و برایانیەوە لەگەڵ محەممەدی عیساغا و جەماعەتی لە کۆیێ کوژران. دەسنووسەکە لە حەفتاکاندا بۆ کۆڕی زانیاری کورد هات و هەر لەوێش مایەوە.

سەرچاوەی دووەم چوارینەیەکی باپیری باپیرم، مەلا عەبدوڵڵای «واثق بالله»یە کە بە عەرەبی لە پەراوێزی کتێبێکی کتێبخانەی جەلیزادانی نووسیوە دەڵێ:

لقد جری حکم الحکیم الاحد

فی ثالث الشوال فجر الاحد

بنهب کو و القتل للاکابر

للظهر فی «غرلجد» بالابجد

وشەی «غرلجد» بە حیسابی «جمل» 1237 دەگرێتەوە. جەژنی ڕەمەزانی ناو دەسنووسەکە و «ثالث الشوال» ی چوارینەکەش کە دەکاتە ڕۆژی سێیەمی جەژنی ڕەمەزان یەکدی بەڕاست دەگێڕن.

لە دوای ئەم نمایشتەی سەرگوزەشتی غەفوورییان و دەرکەوتنی هەڵە و ناتەواوی تێیدا، بەتێبنی کردنی ئەوەی کە ڕاگەیاندنی گشتی ی سەرگوزەشتەکە و ڕووداوی بێشوبهەی تێیدایە بەرەو سەلماندنی بنگەکانیمانەوە دەبات ڕەوا دەبینم بڵێم، غەفوورییەکان لە قەڵای دمدمەوە دەربازبوون بەو جۆرەی باسمان لێوە کرد کە باپیرەگەورەیان بە دەباغچییەتی لە کۆیێ گیرسایەوە دوای چەند پشتێک بوون بە یەکێک لە دووبنەماڵە هەرە بەهێزەکانی کۆیێ. لەپاش مردنی غەفووراغا کەوا ڕەنگە بەوەوە هەڵبدرێنەوە هەر وەک دەشێ پێشتریش غەفوور ناویان هەبێ و لەقەبەکە لەو کۆنتربێ، قەتلوعامی بنەماڵەکە لە 1237 دەکرێ. کوڕەکانی «حمداغا، عەبدوڵڵاغا، ئاوڕەحماناغا، برایماغا، مەلادەروێش، عەلیاغا»لەگەڵ خزمی دیکەی کە بێگومان نیمچە عەشیرەتێک بوون و دۆستی بەرەی ماڵی عیساغاش بوون، هەموویان دەکوژرێن. مەحمووداغای باوکی حەماغا کە کوڕی حەمەداغاکەی سەرەوە بووە یەکێک بووە لەو منداڵانەی ڕزگار دەکرێن. جگە لەو منداڵانە چەند پیاوێکی دیکەشیان خۆی قوتار کردووە و بوون بە سەرباز لە لەشکری پاشای کۆرە. مەحمووداغا کە لە 1237 منداڵ بووبێ ڕێی نامێنێ لە 17، 18 ساڵاندا ببێتە شەڕکەر و ناو دەربکات و بشگەڕێتەوە بۆ کۆیێ و ژن بهێنێ و حەماغای لێببێ. دەبێ پیاوی کامڵ هەبووبێ لە قەسابخانەکە دەرچووبن و لە لەشکری پاشای کۆرە دامەزرابن و جەوانمەردییان لێدیترابێ و بە نەوازشتەوە گەڕابنەوە کۆیێ. دیارە ئەم گەڕانەوەیان لە ساڵێکدا بووە کە جارێ پاشای کۆرە دەسەڵاتی هەبوە و حەسایەوەش بووە دەنا لەو ساڵانەی دوایی

حوکمڕانییەکەی لەترسی پلانی پاشاکانی عوسمانلی نەپەرژاوەتە سەربەخشین و خەڵاتکردن. جا ئەگەر بگوترێ پاشا ئەمانەی بۆ بەهێزکردنی سنووری لای کۆیەی بۆ کۆیی ناردبنەوە لەوەدا دوو تێبینی بەرهەڵستیمان لێدەکەن: یەکەم ئەوەیە کە پاشا دۆستی حاجی بەکراغای حەویزی بووە تا ئەوەی لە ڕەوی بۆ سەر داسنییان لەگەڵیدا بووە و کچێکی لە بەگزادانی داسنیەکانیشی لێمارە کردووە کە بۆتە دایکی حاجی تاهیراغای باوکی حەمەتەیب ئاغای مەشوور بە خاوەن فابریقەی جغارە لەبەغدا. پاشا لەوانە نەبوە ناحەزێکی لە کۆیێ دەسەڵاتی هەبێ. بەلای منەوە غەفووریەکان بەر لە 1250 ک. گەڕاونەتەوە بۆ کۆیێ کە جارێ پاشای کۆرە لە تۆغیانی دەسەڵاتدا بووە، لەمەشدا بنگەی بەراوورد کردنمان بەدەستەوەیە:

حاجی مەلائەسعەدی باوکی باپیرم بەخەتی خۆی نووسیوەتی دەڵێ کە باوکم لە 1246 ک. بە تاعوون مرد پاشای ڕەواندز زۆر ڕێزی لێنام و لەشوێنی باوکمی دانامەوە «بڕوانە لاپەڕە 8 لە کتێبی المصقول في علم الاصل - دانانی باوکم- کە لە لایەن وەزارەتی ئەوقافی عێراقەوە لە 1401 هجرية- 1981 لە چانچانەی موسسة المطبوعات العربية- بيروت بەچاپ گەیشتووە».

دوور نابینم هەر لەو سەروبەرەدا کە پاشا خۆی لەکۆیێ بووە ڕێی بە غەفوورییان دابێ بگەڕێنەوە بۆ کۆیێ. هەر ئەمەیش دەگونجێ لەگەڵ ئەوەی کە مەحمووداغای باوکی حەماغا لە 1237 ک. منداڵ بووبێت و لە ساڵانی نێوان 1246- 1250 ک. بە جحێڵی هاتبێتەوە کۆیێ و ژنی هێنابێت و لە ساڵانی 1253- 1255 ک حەماغای بووبێ.

جگە لەم لێکدانەوەیەش، دەبێ بزانین کە غەفوورییەکان لە سەردەمی مەحمووداغا و حەماغای کوڕیدا بووبوونەوە بنەماڵەی دەسەڵاتداری قەوغا کە مومکین نییە لەو پێنج ساوایە کەوتبێتنەوە هەموو ماوەش بۆ پەرەستاندن و دەسەڵات پەیداکردن بریتی بێ لە 10- 15 ساڵ، با خاتری تۆبێ و بڵێین 20

ساڵ. وابزانم ئەم لێکدانەوەیە و بۆچوونە لەگەڵ مێژووی بێگوماندا ڕێکدەکەوێ، خۆ ئەگەر ناوەڕاستی نیشانیشم نەپێکابێ کەناریم ئەنگاوتووە، بەهەمە حاڵ غەفووری هەبوون و قەرەباڵغ و دەسەڵاتداریش بوون لەو سالانەی کە ئێمە دەمەتەقەیان لەسەر هەڵدەستێنین.

جگە لەو زانیارە لێقرتاو و هەڵە تێکەوتووەی کە لە زاری واحیداغا بیستراوە سەرچاوەیەکی دیکەش هەیە لە دەماودەمەوە بۆتە دەستنووس باسی بنەچەکەی غەفوورییان دەکات. ئەم سەرچاوەیەیان «مراد دیار»ی شاخەپیسکەیی بۆمانی باس دەکات لە دەستنووسێکدا کە لەسەر خواییشتی خۆی کاک حاجی محەیدین«محي الدين» ئەرکی پاکنووسکردنی کێشاوە و بۆ منی ناردووە. کاک مراد دەفتەرێکی دیکەشی پاکنووس کردوە لە ژێر سەرەناوی «کەمێک بدوێم» بریتییە لەو باسانەی حەماغا کە لە کەسانی شارەزای بیستووە. کە دەفتەری یەکەم کورتی هێناوە دەفتەرێکی دووەمی لەو باسانە پڕکردۆتەوە و بوونەتە دوو دەفتەر. وەک کە لە کۆتایی دەفتەری دووەمدا نووسیوەتی، کاک مراد بەتەمای چاپکردن و بڵاوکردنەوەی نووسینەکەی لەلایەن کاک حاجی محەیدینەوە دەفتەرەکانی تەسلیم بەو کردووە، کاک حاجیش کە زانی من خەریکی نووسینم لەسەر حەماغا دەفتەرەکانی بۆ ناردم بەڵام نەختێک بە تەئخیرەوە، چونکە کە ئەم دەفتەرانەم گەییشتنێ من لە نووسینی بەراووردکردنی قسەکانی واحیداغا بووبوومەوە. بەهەمە حاڵ ئەگەر دەفتەری سەر بە باسی بنەماڵەی غەفووری و دوو دەفتەرەکەی سەر بە باسی حەماغا بخرێنەوە سەریەک دەوری لاپەڕەیەکی چاپکراویان لێپەیدا دەبێ. وا لەپێشەوە بەکورتی ناوەرۆکی دەفتەری سەر بە بنەچەکەی غەفوورییان بۆ ئێرە ڕادەگوێزم، دواتر کە گەیشتینە کردەوەکانی حەماغا چی شیاوی ڕاگوێستنە لە دوو دەفتەرەکەی دیکە بۆ ناو ئەم باسەی حەماغا ئەویش دەخرێتە بەر نیگای خوێنەرەوە. کە دەشڵێم «چی شیاوی ڕاگوێستنە» مەبەستم ئەوەیە بڵێم هەندێک لەو باس و خواسانەی ناو دوو دەفتەرەکەی دوایی بەجۆرێکی ڕێکوپێکتر لەسەرچاوەی

دیکەوە بەمن گەییشتووە زۆر سپاسی ئەرکی کاکە مرادیش دەکەم کە
خەرمانێکی حازربەدەستی لەبابەتی سەر بە غەفووری و حەماغای نایە بەر
دەستم و لێی سوودمەند بووم، سپاسیش بۆ کاک حاجی کە ماندوو
بوونەکەی خۆی بە نووسینەکەی من ڕەوا دیت.

کاکە مراد لە دەفتەری ژێرسەرە ناوی «بنەماڵەی غەفووری لەچییەوە
هاتوون» بۆمان باس دەکات دەڵێ کە لە دەمێکەوە خەریک بووە بگاتە
بنەچەک و ڕیشەی بنەماڵەی غەفووری تا شەوێکیان لە ماڵی ئەفەندییەک
بووە لە کۆیێ «ناوی ناهێنم»و لەبارەی غەفوورییان لێی بیستووە
گوتوەتی، «غەفووری لەجێی خۆی خۆشناوی مێوژ و دۆشاو فرۆش بوون
هاتوون لێرە بوون بە ئاغا»... سبەینە چووە بۆ لای مامۆستا زەکی هەناری
قسەکەی بۆگێڕاوەتەوە ئەویش دوای سەرلەقاندنێک هەڵستاوە لەناو
جامخانەی کتێبان دەفتەرێکی دەرهێناوە و پێی داوە، کە دەبینێ باسی
غەفوورییانە لە دەستنووسی محەممەد توفیق وردی.

دەستنووسەکە لەپێشەوە باسی هۆزی برادۆست دەکات کە لە عێراق و ئێران
هەن، سەرۆکێکی قارەمانیان هەبووە لە ناوخۆیان پێیان گوتووە ئەمیرخان
هەرچەند ناویشی ئەحمەدخان بووە، لەو سەردەمەدا میری سۆران
عومەربەگ بووە، ئەمیرخان شەڕێکی لەگەڵدا دەکات و ژێر دەکەوێ و
دەستێکی تێدا دەشکێت و ڕووی کردۆتە لای
شاعەباسی «قاجار»؟؟ «دەزانین شاعەباس صەفوی بووە بەر لە قاجاران
حوکمڕان بوون». شاعەباس قەدری دەگرێت و تەکلیفی هەڵدەگرێتەوە کە
لە شا داوا دەکا ڕێی پێبدا لە «دمدم» قەڵاتێک دروست بکات. شاعەباس
دەستێکی زێڕنیگاری لە شوێنی دەستە شکاوەکەی ئەمیرخان چەسپ کردو
بۆی بوو بە لەقەب و پێی گوترا خانی لەپ زێڕ.

بەدوا ئەمەدا کاکە مراد ڕیوایەتێکی بۆ لەپەزێڕینەکەی خان دەگێڕێتەوە لە
زاری مارف سەفەر کەوا لە تیرەی کەمل و لە هۆزی جاف و دانیشتووی

گوندی شاخەپیسکە بووە کە نشیمەنی کاکەمرادیشە. مارف سەفەر گۆرانی بێژیووە گوتوەتی شێرێک غەزریوە، خانیش ویستووەتی بیگرێ، شێرەکە دەستێکی خواردووە، خان بە دەستەکەی دیکەی شێری ملزەم کردووە و بۆ شای بردووە:

کاکە ئەو هەواڵە چییە

شێرەک لە چەمێ خەزرییە

دەستێکی خانی خواردییە

بە دەستی دی گوێی گرتییە

بە دیاری لۆ شای بردییە

لۆ تۆم هێنا بە دیارییە

شابانگی کردە کورانە

بابوبێ بە قوربانە

دەستەک لە زیرو دوڕانە

بکەن بۆ خانی کوردانە

وەستا هاتن بۆ دوکانێ

چەکوشیان دا لە سندانێ

شالۆی ناردوون فەرمانێ

دەستەک دروست کەن لۆخانێ

قسەی مارف سەفەر لێرەدا دەبڕێتەوە ئیتر دەچینەوە بۆ باسی قەڵای دمدم لە نووسینی توفیق وردی. شا بە پارەیەکی زۆرەوە شوێنی قەڵای دمدمی بە

خان بەخشی. ئەو پایەی شا لە خانی لەپزێڕی نا حەسادەتی زۆر کەسی لە سەرۆکەکان بزاوت و خستینە سەر پلانگێڕی... خولاسە دڵی شایان لە خان کرمێ کرد. لەمانە 1- محەممەد بەگ بیگدل لەسەرانی قزلباش و 2- حەسەن خانی برای 3- محەممەد پاشای سەرۆکی هۆزی جەلالی و 4- محەممەد یوسف کە ئەویش جەلالیە، 5- بە دوا ئەواندا خەلیفە ئەلیاسی جەلالی. گۆیا ئەم پێنج کەسە لەخان خەریک بوون. بەڵام خان خەریکی کاری خۆی بوو، لە کوردەکانی ئازەربایجان سپایەکی کۆکردەوە و خزاندییە ناو قەڵات.

مارف سەفەر لێرەشدا بەدەنگ دێتەوە و دەڵێ:

خان کەوتە جۆل و جمێ

وەستای برد لەگەڵ تاقمێ

دروست کا قەڵای دمدمێ

لۆ خۆی ببێ بە حاکمێ

گۆیا خان ئاودەل خانی سەرداری موکریان بە حەفتسەد کەسەوە چووە بۆ یارمەتی خانی برادۆست. شاعەباس سپای کۆکردەوە بۆ سەر قەڵای دمدم. ڕۆستەم سوڵتان فەرمانڕەوای تەورێز کرا بە چەرخەچی باشی لەشکر. لەهەموو لایەکەوەورووژم هات بۆ سەر قەڵا. لەشکری قاجار «دەبوو بڵێ سەفەوی» لەتارانەوە «دەبوو بڵێ لە ئیسفەهانەوە» ڕووی کردە دەوری قەڵا لە ژێر فەرمانی سەرهەنگ قاجاردا!؟ گۆیا سەرۆکایەتی هەموو هێزەکان درابووە محەممەد پاشای جەلالی چونکە هێزی جەلالیان لە هەموان پتربووە. شەڕ بەردەوام بوو تاوای لێهات خەڵقەکەی وەڕس کرد. خەلیفە ئەلیاسی قزلباش بە بەهانەی نەخۆشی کشایەوە لە شەڕ. جەلالیش پەشێوییان تێکەوت بەشێکیان بە محەممەد پاشا ڕازی نەبوون ڕوویان وەرگێڕا بۆلای قەرە محەممەد یوسفی جەلالی، بۆیە محەممەد پاشا لەو شەڕە پاشەپاشەی

بوو. بەڵام هێزی حکوومەت ڕۆژبەڕۆژ لە زیادیدا بوو. لێرە بەدواوە قسە لە گیوی موکریانی دەگێڕێتەوە کە گوتوەتی وەلی بەگی موکری لەگەڵ هەشت پیاوی شەڕکەر دەچنە لای دوژمنەکان، واتە لەشکری شا و لەبری مەرحەمەتی شا شوێنی ئەو کانیەیان نیشان دەدەن کە ئاوی لێوە دەچێ بۆ ناو قەڵات.. ئاوەکە گیرا ئیتر برادوستییەکان چارەیان نەما غەیری تەسلیم. بەڵام ئولوغ بەگی برازای خانی لەپ زێڕ بە دووسەد کەسەوە دەرباز دەبن بۆ ناو شاخەکان. دوو خێزانی خان «پەریزاد خاتوون و دەوڵەت خاتوون» بەدیل دەگیرێن و دەبنە کارکەری ماڵی «محەممەد بەگ بیگدل»ی قزلباش و لە ژێرەوە هەموو باس و خواسێکی لایەنی حکوومەت بۆ ئولوغ بەگ دەنێرن. شەوگارێک ئولوغ بەگ بەخۆی و ئەو دووسەد کەسەوە هەل وەردەگرێت و قەڵا داگیر دەکاتەوە.. دیسانەوە دەبێتەوە شەڕ. ڕێکەوت وەهابوو لە دەمی دابەشکردنی بارووت بەسەر لەشکردا پریشکی گوللەیەکی تفەنگ کەوتۆتە ناو سندوقی بارووت و ئولوغ بەگ و هەشت کەسی لەگەڵدا سووتان. تەرمەکانیان بەنهێنییەوە ڕزگار کرد بەڵام قەڵا یەکجارەکی بوو بە هی شا.

لێرەدا کۆتایی قسەکان دێن بێئەوەی شتێک بزانین لە بارەی ڕیشەی بنەماڵەی غەفوورییەوە بەڵام کاک مراد یەکسەر دەست دەکاتەوە بەقسە گێڕانەوە لە مام ساڵح کە مەشوور بوو بە ساڵحەڕەش و خەڵقی کۆیێ بووە، هاتوچۆی شاخەپیسکەی کردووە و کاک مراد قسەی لێبیستووە کە گوتوەتی غەفووریەکان لە نەوەی مەلاشەرەف ناوێک کەوتوونەوە کە لە دەست سپای شاعەباس هەڵاتووە بۆ دیوی عێراق. هەوەڵ جار لە دێی «وڵاش»ی ناوچەی ڕەواندز نیشتەجێ دەبێ دواتر سێ کوڕی ئەو لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە دەچن بۆ دێی وەرتێ. مام ساڵح ناوی کوڕەکانی زانیوە بەڵام کاک مراد لەبیری نەماون. میری وەرتێ ناوی میرمحەممەد ئەمین بووە، بەچاوی ڕەعیە سەیری ئەوسێ برایەی کردووە گۆیا میر محەممەد ئەمین عادەتێکی هەبووە پێی دەڵێن «ترکی کەلام» کە بریتییە لە

قسەنەکردن هەتا ڕۆژهەڵات بە نیازی خواپەرستن. ئەو سێ برایە بە تەگبیر شەوێکیان ماڵیان سەرلەبەر کردبووە بن بار و ئامادەی ڕۆییشتن بوون، سبەینە میرمحەممەد ئەمین زوو دێتە مزگەوت بۆ نوێژ، براکان دەچن لەژووری مزگەوت دەیکوژن و بە بەڕە و حەسیر دایدەپۆشن خۆشیان بار دەکەن دێن بۆ کۆیێ. بەینێک ماڵی میر وادەزانن جارێ میر هەر لە مزگەوتە عیبادەت دەکات. دیارە تا دەزانن کوژراوە سێ براکە دوور دەکەونەوە.

قسەی ساڵحەڕەش لێرەدا کۆتایی دێت. ئنجا ئەگەر بڵێین داستانەکەی دمدم و قسەکەی ساڵحەڕەش پێکەوە سەرگوزشتەی غەفوورییان تەواو دەکەن دەزانین ئەم ڕیوایەتەش بە شێوەیەکی مەیلەو پێچەڵپێچ لەگەڵ قسەکانی واحیداغا تێک دەکەنەوە. لێرەدا پێویست نابینم بەجۆرێکی تایبەتی لەگەڵ ئەم تازە خەبەرانە خەریک ببم، چی لەبارەی قسەکانی واحیداغاوە گوترا بەر ئەمەشیان دەکەوێ چونکە بەزاهیر وەها پێدەچێ بە ئەسڵ لەیەک سەرچاوەوە هاتوون.

تێبینی هەرە دوایی لەبارەی ڕەچەڵەکی غەفوورییانەوە:

ئەگەر غەفووری لە نەوەی ڕزگاربووەکانی «دمدم»بن کێشەیەک دێتە پێشەوە لەوەدا ئایا دمدمییەکان لە کوێوە هاتوون و لە کوێوە داکەوتوون: ساغکردنەوەی ئەم لایەنە لە ئەستۆی من نییە، کە هێماشی بۆ دەکەم لەوەوە دێت، نامەوێ بێباک بم لە ئاست هیچ سەروبەرێکی ئەو دمدمەی کە ئەگەر لە ئەنجامدا بۆ خۆیان نەزۆکیش بووبێ، بۆ مێژووی کورد سامانێکی قارەمانەتی ئەوتۆی بە خوێن لەو شاخ و دۆڵ و بەرد و دارەی مەڵبەندێکی کورد نەقش بەستوو کردووە هیچ مەردایەتییەک لێی تێپەڕ ناکات. ئامادەم بسەلمێنم خۆ هەڵسوون لە خاک و شاخی وێرانگەی ئەو قەڵایە هار چاک دەکاتەوە، فێدار وەهۆش دەخاتەوە، ئیفلیج دەهێنێتەوە سەرپێیان... لەمەوە بەتەمام ڕۆشنبیری کوردیش لە باسکردنەوە و هەڵسەنگاندن و پشکنینەوە تێیدا بەشێوازێک بدوێن لەگەڵ گیانی خەللاقی

ئەو مەلحەمەیەدا بگونجێ. ئەوان ڕووبەڕووی بێگانە وەستان و شەهید بوون، ڕۆشنبیری کوردیش لەبەر خاتری ئەوان دەبێ هەراکە لە سنووری نێوان کورد و بێگانەدا بە توێژینەوە هەڵایسێنێتەوە نەک بیکاتە هەرای ناوەکی.. تەماشای کتێبی «بطولة الكرد في ملحمة قلعة دمدم» بکە لە ئامادەکردنی جاسم جەلیل و وەرگێڕانی بۆ عەرەبی لەلایەن شکور موستەفاوە و پێشکەشکردن و پێداچونەوەی د.عیزەددین موستەف ارەسووڵ «دار الحرية للطباعة 1983» ئنجا بچۆوە بۆ کتێبەکەی ئۆسکارمان و پێشەکیەکەی هێمن موکریانی «لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد- ساڵی چاپیم لەبیر نەماوە» مەبەستم تێدەگەیت. لەم قسەیەشدا لایەنگیر نیم. دەڵێم دەبێ لەسەرەخۆ بدوێین لەوە بەولاوە ڕاستی چی دەبێ بابێ.

ئەگەر دمدمیەکان وەک کە جاسمی جەلیل پێمان دەڵێ لە جەلالییان بن غەفووریش دەبنەوە بەتیرەیەکی ئەو عەشیرەتە هەرە زلەی کورد کە چەندین تیرە و هۆزی لێکەوتۆتەوە و بە کوردستاندا بڵاو بوونەتەوە. وا دەزانم ئەگەر ئەمە ڕاست بێ باشتر دەگونجێ لەگەڵ ئەو قسە داستانییەی ناو دەفتەرەکان کە دەڵێ غەفووری لە قەڵەمڕەوی ڕووسانەوە هاتن بۆ پەنا بردن بەشای ئێران چونکە جەلالی لەسەرووی دمدمەوە کەوتوون بەلای ڕووسیادا، لەقەڵەمڕەوی ڕووسانیش جەلالی هەبوون.

بە هەمە حاڵ ئەم سەرێشەیە بۆ مامۆستا موسلیح جەلالی بۆی دانووساندووە، چونکە ئەو بەپێی خەریکبوون و نیسبەتی نەسەبیشەوە پێوەندیی بە باسەکەوە هەیە، ئیتر تا کوێ توێژینەوەی بۆ مەیسەر دەبێ کاری دوارۆژە.

حەماغای گەورە

لە درەختە نەسەبیەکەی غەفوورییان دەرکەوت حەماغا کوڕی مەحمووداغای کوڕی حەمەداغا «حەماغا»ی کوڕی کەریماغای کوڕی غەفووراغایە. دیارە بەناوی باپیری کراوەتەوە. لەغەفووراغاش بەپشتەوە سەروسۆراغی ڕوون

چەنگ ناکەوێ. ئەوەندە هەیە ئەگەر ڕاست بێ یەکەم کەسی کە لە غەفوورییان هاتبێتە کۆیێ ناوی غەفوور بووبێ مەعلووم دەکرێ هەر نەبێ دوو غەفوور ناو لەو بنەماڵەیە نیشتەجێی کۆیێ بوون، دووەمیان ئەوەیە کە پاش خۆی کارەساتی قەتلوعامی غەفوورییان ڕوویداوە. قۆتاس و مەروان خالید و سالْحیێکیشمان بەدی کردن کە دەبێ بەر لە غەفووری یەکەم ژیابن، پێش ئەوانیش لە دەربازبووەکانی دمدم ئاوڕەحماناغا و مەحمووداغا و کەریماغاش ناویان هات لە باپیرەگەورەی سێ بەرەبابی غەفووری و شەرەفانی و ئەسپیندارەیی بوون و غەفووری لە کەریماغا پاشەکەوت دەبن. لەوە بەولاوە هیچی دیکەی بێگومان و بەگومان لە ناودارانی بنەماڵەی غەفووری ناس ناکەین. بەڵام دەبێ بڵێین لە حەماغاوە هەتا غەفووراغا کە دەکەن پێنج پشت جێی گومان نییە.

دایکی حەماغا، هەر ئەوەندە دەزانین ناوی ڕەحمەبووە و حەماغاو سمایلاغای لێبەجێماوە. دایکی حەسەناغای برای حەماغا لە مەلازادەکانی خەتێ بووە.

مێژووی لەدایکبوونی

لە هیچ سەرچاوەیەکی نووسراو یان دەماودەم نەزانراوە حەماغا چ ساڵێک لە دایک بووە، هەرچی لەم بارەوە بگوترێ کاری لێکدانەوەیە. من لە دوو کوێرە ڕێگاوە بەرەو ساڵیک دەچم ڕەنگە زۆر لەڕاستی نزیک بێ. یەکیان ئەوەیە کە بە تەواتور دەزانین حەماغا لە 80 ساڵ پتر ژییاوە. ئەم زیادییە لە هێندێ خەبەردا دەگەییشتە 4 ساڵ واتە 84 ساڵ ژییاوە. ئێمە ساڵی مەرگی دەزانین کە 1920ز. ئەم ساڵە دەکەوێتە بەرانبەر 1338، 1339 ک. کە بڵێین:
1338- 84 = 1254 ئەم ژمارەیەی 1254 دەبێتە مێژووی لە دایکبوونی، هەر ئەمەیش لەبارترە لە ساڵێکی دیکەی وەکوو 1255 یان 1256 بۆ بەراووردکردن لەگەڵ بڕیاری کوێرە ڕێگەی دیکە.

ئەم کوێرە ڕێگایەی دووەم ئەویش بە لێکدانەوەمان خەریک دەکات، بەڵام بنگەیەکی مەحکەمی بێگومانی لەگەڵدایە کە نەهێڵێ وشکە مەلە لە هەوادا

بکەین. لە نووسینی دیکەمدا باسم کردووە کە باپیرم لە خوێندنی باڵەکەتی ئاشقی حەلیمەی مەلای شێخ وەتمان بووە. چەندی دەکا باوکی، حاجی مەلا ئەسعەد، بۆی داخوازی ناکات، ئەویش بێ پرس مل دەنێ بۆ لای مەلاعەلی تورجانی لە مەڵبەندی سابڵاغ کە داخوازیەکەی بۆ بکات. گێڕابوویەوە گوتبووی، کە گەییشتمە دەربەندی ڕەمکان ماندوو بووم لەبن دیواری قەڵاکەی دەربەند سەرم بە بەردێک کردو نووستم. کاتێک لە ڕەپەی پێی زەلامێک خەبەرم بۆوە کە سەیرم کرد حەماغا بوو لە بانی قەڵاتەوە دیتبوومی هەر لەوێوە خۆی هەڵدابوو بۆ سەر زبڵگەیەک بانەکەش زۆر بڵند نەبوو بە سەلامەتی دابەزی... پێی گوتم فڵانەکەس دەزانم نیازت چییە، وەرە بەسەرمدا تێمەپەڕە و نامەردم مەکە با من ئەم مەسەلەیەت بۆ جێبەجێ بکەم. باپیرم پێی دەڵێتەوە نییەتم هەڵقەناوە بۆ لای مەلاعەلی. حەماغا لەو ساڵەدا میرقەڵات بووە کە بە زاراوەی ناوچەیی کۆیێ پێی دەڵێن «ئاغا دەربەند». لە نووسینی دیکەمدا بە لێکدانەوەی تێروپڕ ئەم ساڵەی پەنابردنی باپیرم بۆ مەلای تورجانی لە 1275 تێپەڕ ناکات، چونکە باپیرم بە ئیلحاحی حاجی مەلائەسعەدی باوکی لەپاش ئەم ساڵە کچی حاجی بەکراغا مارە دەکات و لە 1278 دووەم کچی لێی بەرهەم دێت. هەڵبەت ئەو تۆرانەی باپیرم کە حاجی مەلائەسعەدی ناچارکرد بەدوایدا بچێت و لە دەوروبەری سەردەشتەوە بیگێڕێتەوە بۆ کۆیێ بەدوا ئەوەدا هەتا ئاشتی دەکاتەوە و لە حەلیمەی ئومیدبڕ دەکات و پێی دەسەلمێنێ کچی حاجی بەکراغا بهێنێ بەلای کەمەوە ساڵێکی ویستووە دەخرێتەوە سەر 1275 ئنجا مومکین دەبێ تا 1278 دووکچی لەو تازەبووکە ببێت. کە ئەم لێکدانەوەیە بسەلمێنین، چ ڕێی نەسەلماندنی ڕوونیش شک نابەین، دەبێ لەو ساڵەی 1275دا حەماغا تەمەنێکی هەبووبێ لە میرقەڵاتی و خوازبێنی وەها گرنگ بوەشێتەوە. ئنجا ئەگەر لە 1254 هاتبێتە دنیا لە 1275 تەمەنی 21 ساڵەتی بووە.
ڕاستییەکەی ئەگەر مەودای 84 ساڵ عومر ڕێگەی لێنەبڕیبایناەوە کە بەرەو پێش 1254 مانەوە ببات دەمگوت 21 ساڵ کەمە بۆ ئەم کارانە. خۆم

هەمیشە بۆ ئەو باوەڕە ڕۆیشتووم کە ساڵی 1253 لەبارترین ئیحتیماله بۆ لەدایکبوونی حەماغا، چونکە لەوەدا تەمەنەکەی هێندە هەڵدەکشێ کە هیچی دیکەی بەبەرەوە نامێنێ بۆ کامڵتربوون لەو ڕووەوە کە ئەگەر بەرەو دواتریەوە ببەین حیسابی دیکەمان لێتێک دەدات وەک ئەمەی کە دەزانین حەماغا بە تەمەن لە حاجی مەلاعەبدوڵلا بچوکتر بووە. ڕەنگە فەرقی ئەو سێ ساڵەی نێوان 1253 کە ساڵی وەلادەتی حەماغا بێ و 1250 کە ساڵی وەلادەتی باپیرمە بایی جودایی تەمەنیان بکات، دەنا حەزم دەکرد بڵێم حەماغا ڕۆڵەی 1250یەچونکە ئەوسا لە 1275 دەبێتە گەنجێکی 25 ساڵەیی کە لێی بوەشێتەوە خۆ بهاوێتە ژێر بارێکی وەها قورسی خوازبێنی کردن و گواستنەوەی کچی مەلای شێخ وەتمان بۆ کوڕی حاجی مەلائەسعەدی کۆیێ لە حالێکدا مەلائەسعەد بەوە ڕازی نەبێ لە غەفووریانیش براگەورەی لە حەماغا گەورەتر و قسە ڕۆییشتووتر هەبووە لێی بوەشێتەوە بەرهەڵستی لێبکات یەکێک لەوانە مەحموداغای باوکی.

قسەیەکی دیکە هەیە نەختێک نەگونجان لەگەڵ ئەم بۆچوونە پەیدا دەکات. گۆیا کە حەماغا ئاغا دەربەند بووە جارێ ژنی نەهێناوە. غەفووری دەڵێن زڕداکێکی لە گەڵدا بووە وەزعی ماڵ و مێوانی بۆ ڕاگرتووە و سەرپەرشتی دیوی حەرەمی کردووە. حیکایەتێکی تاڵ وتفت بەدوا باسی ئەو زڕدایکەدا دێت جارێ کژی نەهاتووە، لێرەدا تەنها دەلالەتی تەمەنی حەماغا لەهەبوونی ئەو زڕدایکە لای وەردەگرین. نەگونجاکە لەوە دێت کە مانەوەی حەماغا بە ڕەبەنی بۆ تەمەنی 23، 24، 25، ساڵەیی لەگەڵ حاڵ وباری ئەوو ئەوسادا ناگونجێ، واتە ناشێ حەماغا تا ئەو تەمەنە وەخرابێ لەژن هێنان. لێکدانەوەکە بێجێ نییە بەڵام بەڵگەی وەها بەدەستەوە نادات لێکدانەوەی بەهێزتر هەڵوەشێنێتەوە بە نموونە دەڵێم:

1- کەس ناتوانێ بڵێ کام تەمەن بڕیاری لەسەر دەدرێ بۆ ژن هێنانی یەکێکی وەکوو حەماغا لەو ڕۆژگارەدا لەوانەیە بگوترێ 18 ساڵ لەبارە بۆ ئەو بڕیارە کە ئەوسا لە 1275 بەپێی هەڵبژاردنی ساڵی 1254 بۆ لە دایکبوونی

حەماغا تەمەنەکەی بە 21 ساڵ دەگەیەنێ. لەمەش بترازێ ئێمە نازانین چەند ساڵی دیکەش حەماغا ئاغا دەربەند بووە تا ئەو ساڵانەش بخەینەوە سەر 21 ساڵ و پتر لە 18 ساڵەی دوور بخەینەوە. کە 18 ساڵەیی نەگونجێ لەگەڵ حیسابەکەمان 19 ساڵەییش هەروەها و پێبەپێ هەموو ساڵانی دواتر ناگونجێن.

2- چ سەیروسەمەرە لەوەدا نییە وەها ڕێککەوتبێ حەماغا نەیتوانیبێ خێرایی بکا لەژن هێنان بەڵگەی ئەم قسەیەش لەگەڵ خۆیدایە، چونکە هۆی گەورەتر لە ئاغا دەربەندی و دوورکەوتنەوە لە کۆیێ پەیدا نابێ بۆ پەلەکردن لەژن هێنان. خەڵق لەهەموو ڕۆژگارێدا بۆ کاروباری دنیایی و قیامەتیش هەمەجۆرەن، نە هەموویان نوێژ بەجەماعەت دەکەن نە هەموویان لەتەمەنێکدا ژن دەهێنن، نە هەمووشیان حەیرانەیان پێخۆشترە لە باڵۆرە. دیتمان حاجی مەلاعەبدوڵڵا لە تەمەنی 26 ساڵیدا ژنی هێنا خۆ ئەگەر مەسەلەی حەلیمە نەبایە لەوانەبوو هەتا کۆتایی خوێندنی ژن نەهێنێ. کاکە زیادی حەماغا چونکە تاقانەی حەماغا بوو لە 14 ساڵی ژنی هێنا، هەرچی حەماغا بوو، دوو برای دیکەی هەبوو، مەحموداغای باوکیشی بەبەریەوە مابوو کوڕی دیکەی ببێ.

پێی ناوێ چی دیکە بەدوا ئەم کێشەیە بکەوین. بایی ڕوونکردنەوەی لایەنی ساڵی لە دایکبوونی حەماغا دوایین، ئیتر خوێنەریش وەکوو من بۆخۆی ساڵێک هەڵبژێرێ کە لەگەڵ قەناعەتی ڕێک بکەوێ.

بنەماڵەی غەفووری چونکە لەکۆنەوە بەژیانی عەشاییری و دوورە حکوومەت فێربوون کەمتر بەلای خوێندن و نووسیندا چوون. هەر چەند لە نێوان ئەو کەسانەی درەختی خانەوادەیی ناویان هات هی وەهایان تێدایە بە دەروێش و مەلا و فەقێ هەڵدراوەتەوە لە ڕاستیدا کەمیان خوێندەوار بوون، لەقەبەکەشیان هەر لەوەوە هاتووە کە لەسەرەتاوە کمێکیان خوێندووە بایی ئەو لەقەبە بکات. لە بەراووردکردندا حەوێزی بەلای ژیانی شارستان و

خوێندن و ئەدەبدا چوون لەگەڵ حکوومەتیش سەروکاریان هەبووە. لە سەرەتاوە حاجی بەکراغا کە بە مەلابەکراغا ناسراوە شاعیر و ئەدیب و زانا و خاوەن کتێبخانەی نایاب بووە لە دوای ئەو ئەمیناغا، ئنجا حاجی ئەسعەداغا و حاجی تاهیراغا و ڕەشیداغا هەمووی ئەدیب و خوێندەوار بوون. حاجی تاهیراغا بوو بە ڕەئیس بەلەدییە لە بەغدا خولاسە غەفووریەکان بە درەنگێکی درەنگەوە کەوتنە سەرباری خوێندن و نووسین. ڕەنگە سمایلاغای مەلائەحمەداغای سمایلاغا یەکەم خوێندەوار و خەتخۆش و ئەدەب دۆستی غەفوورییان بووبێ، تەنانەت کاکەزیادی حەماغا چەند ساڵێکی قوتابخانەی سەرەتایی دیت و وازی لە خوێندن هێنا. بۆیەیە سەروبەری وردە حیسابی لە دایکبوون و مردن و ژن هێنان لە نێوان غەفوورییان بەدەگمەن نەبێ نەپارێزراوە چی لە ڕووداوی گرنگی خۆش یا ناخۆشیش کە ڕۆژگار بەرەوپیری هێنابن لە سەرچاوەی غەیری غەفوورییەوە تۆمارکراوە و زانراوە. بەنموونە ئەو ساڵەی حەسەناغای برای حەماغا لە دەربەند کاری ئاغادەربەندی پێسپێرراوە لە ڕێگایەکی غەیری غەفوورییانەوە دەزاندرێ بەوەدا کە دەماودەم هاتووە ڕۆژێکیان کابرایەکی کۆیێ بە پەلە خۆ هەڵدەکوتێ بۆ لای حەسەناغا و جارێ هەناسەی سوارە دەڵێ ئاغا موژدەت لێبێ حاجی ئەسعەداغا مرد. ئەویش ناکاتە نامەردی دەڵێ هەی وەهاوەها لێکراو چما من نامرم. خەبەری بەتاڵانچوونی قافڵەت بۆ هێنابام یان زەرەری دیکەی لێکەوتبێ بۆت باس کردبام، یاڵڵا لە زیێەی هەڵکێشن بەینێک کابرا لە ئاودا دەبەستنەوە ئنجا بەرەڵڵای دەکەن. ئێستا دەبێ پرس بە حەوێزییان بکەین ساڵی مەرگی حاجی ئەسعەداغا چییە هەتا بزانین حەسەناغا کەی میرقەڵات «ئاغادەربەند» بووە. زەرەرێک نابینم لەوەدا بڵێم لە نێوان ئەو کەسانەی لەحاڵ و باری بنەماڵەکانی مەڵبەندی سۆران بەتایبەتی خەتی هەولێر- کۆیە- پژدەر، شارەزان وەها ڕۆیشتووە کە بنەماڵەی سەلیماغای پژدەر و حەوێزی کۆیە و پاشای دزەیی هاومەشرەب بوون لە مەیلیان وەلای ژیانی شارستانانە، پتریش شارەزای یاسا و حکوومەت بوون.

بنەماڵەی مەحمووداغای پژدەر و غەفووریی کۆیە و بایزی دزەییش پتر هۆگری ژیان و نەریتی عەشیرەت بوون، کەمتریش دانوویان لەگەڵ یاسا و حکوومەت کوڵاوە. ڕەنگە بەوردی لە جافەکانیش سەرنج بگرین دیاردەی ئەوتۆیی لە نێوان بەرەبابەکانی ئەوانیشدا بدۆزرێتەوە، یان کە بێینە کەرکووک فەرقێک بەدی دەکرێ لە نێوان مەشرەبی خانەقا و تاڵەبانیەکاندا. بەهەمەحاڵ ئێستا باری هەموو شتێک گۆڕاوە و باسی عەشیرەتگەری و شتی ئەوتۆیی لە نێوان خەڵقدا پواوەتەوە، چی لێرەشدا گوتم بەبۆنەی نەبوونی سەرچاوەی نووسراوەوە بوو لەبارەی غەفوورییانەوە کە ئەگەر هەبایە لە گێڕانەوەی سەرگوزەشتی حەماغادا زۆرمان کەڵک لێوەردەگرت بەڵام داخەکەم..

حەماغای دوای منداڵی

کە بمانەوێ پێبەپێ لەگەڵ فراژیبوونی حەماغادا هەڵکشێین هیچمان بەدەستەوە نییە لە ڕاگەیاندنی حاڵ نەبێ. کوڕە نۆبەرەی براگەورەی بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار کە پێوەندی گوزەران و مەشرەبی بە عەشرەت و دەشت ودەرەوە هەبێ لەتەمەنی منداڵیشدا چ کارەسات و ڕووداوی گەورە نەقەومابێ کار بکاتە سەر باری چەندوچۆنی ژیانی خۆی و بنەماڵەکەیەوە ئا ئەو نۆبەرەیە حەماغایە و ساڵەساڵ گەورە دەبێت و لەگەڵ وڵاغ و چەک و مەڕوماڵ و کشتوکاڵ ڕادێت و تێیدا مەهارەت پەیدا دەکات. بەپێی ئەوەی کە حەماغا لە تەمەنی گەنجایەتییەوە بە دەستوقام و نەترساو و سوارچاک بووە، هەتا پیریش بوو ئەو خەسڵەتانەی پێوە دیاربوو دەبێ لە منداڵییەوە فرچکی پێوەگرتبن بەتایبەتی سوارچاکی و سیلاحشۆڕی. بەڵام لەلایەن سیلاحەوە زۆر حیکایەتی ساڵانی دوایینی عومری وەها ڕادەگەیەنن کە پتر دۆستی تیغ و ڕمب بووە تا چەکی ئاگردار و تەقەمەنی. بارەها بیستوومە لە تێکهەڵقژانی عەشاییریدا حەماغا بە نووکی ڕمب هێندە سوارەی لەسەر وڵاغەوە فڕێ داوە، بۆیە دەبێ کە دەستی سیلاحی گرتبێ بە چەکی کۆنینەی

کلاسیکی ڕاهاتبێ، بەڵام وەک کە وردە باس و حیکایەتی سەر بە حەماغای ساڵانی دوای کامڵبوونی ڕادەگەیەنێ وا دیاردەدا کە پێبەپێی پەرەستاندنی چەکی ئاگردار حەماغاش وردەوردە وازی لە چەکی کۆن هێنابێ، تەنانەت یەکێک لەو حیکایەتۆکانە کە لە نێوان ئافرەتان باس دەکرا ئەوە بوو کە وا هەر جارە حەماغا لەسەفەر گەرابێتەوە بۆ کۆیێ خزمی خێزانەکانی «چونکە هەتا 3 ژنی بەیەکەوە کۆکردوونەوە» ڕاسپاردەیان لە ماڵی حەماغا داناوە بۆ ئەوەی بزانن کە لە دیوەخانە دابەزی تفەنگ و فیشەکدانی بۆ ژووری کام خێزانی ناردووە، چونکە ئەمە عەلامەتی هێندێ بوو کە لەویان مێوان دەبێ. لەو حیکایەتەدا باسی ڕمب وشیر نییە.

کە هاتینە سەرباسی شتێک پێوەندی بە خێزانەوە هەبێ وەها باشە ئەگەر بە شێوەی دەست پێشخەریش بێ ئەم لایەنە لێبدوێم.

حەماغا پێنج ژنی هێناوە بەپێی دەفتەرەکان ناوو زنجیرەی بەدوا یەکدیدا هاتنیان ئەمانەن:

1- ڕەعبەی کچی حاجی بەکراغا

2- عەیشانی کچی ئەبابەکر ناوێک

3- عەیشێ لە سەیدەکانی باداوەی سەر بە هەرێمی شاڵەبەگیان کە ئێستا ئەو دێیە دەکەوێتە سەر ڕێی سەیارەی نێوان ڕانیە و سلێمانێ.

4- حەبیبەی کچی ئەمیناغای حاجی بەکراغا.

5- عەیشە «ئایشە خان»ی کچی حاجی ئەسعەداغای حاجی بەکراغا.

ژنی یەکەمی بێوەژنی سمایلاغای برای خۆی بووە، پاش کوژرانی لە 1284 مارەی کردۆتەوە و بەوەدا بۆتە زڕباوکی دوو برازای، قادراغا و مەلائەحمەداغا.

لەئاست ئەم ئافرەتەدا هەڵوێستێک پێویستە بۆ ڕوونکردنەوەی یەک دوو خاڵی کورتیلەی پێوەندیدار بە باسەکەمانەوە.

خاڵی یەکەم ئەوەیە کە دوای مردنی ئەو ڕەعبەیە حەماغا حەبیبەی ئەميناغا و ئایشەخانی حاجی ئەسعەداغای مارە کردووە، چونکە دەبێتە پووریان و بەشەرع جایەز نییە پوور و خوارزا لە نیکاحی مێردێکدا کۆببنەوە. خەڵق دەیزانی ئایشەخانی کچی حاجی ئەسعەداغا کە دوایین ژنی حەماغا بوو دوای مردنی پووری مارە کراوەتەوە، بەڵام بە نیسبەت حەبیبەوە پرسیارەکە هێندە ڕوون نییە، ڕەنگە خەیاڵیشی لێنەکرێتەوە. وەک دەزانین حەبیبە و ئایشەخانیش ئامۆزا بوون کەچی کەس و کاریان کە سەرۆکی حەوێزییان بوون ڕازی بوون بنەوە هەوێ. ئەگەر خۆشەویستی و دۆستایەتی لەنێوان غەفووری و حەوێزییاندا هەبوایە دەمانگوت لایەنی خۆشەویستی بەسەر ئەم تەگەرەیەدا زاڵ بووە کە ئەمە وەها نەبوو دییارە بەرژەوەندی مەعقوولیان لەوەدا ڕەچاو کردووە کە شوێن و جێگەی وەکوو بەروماڵ و دیوەخانەی حەماغا لە سەرپەرشتیکردنی ئافرەتی حەوێزیدا بێت چاکترە بۆیان لەوەی ئافرەتێکی دیکەی بە دەسەڵات لە بنەماڵەیەکی دیکە شوێنی وەها گرنگ پڕبکاتەوە. ڕاستییەکەی هەموو حیکایەتێکی کە لە ئایشەخانی دەگێڕنەوە چ لە ژیانی حەماغا دابێت و چ دوای مردنیشی بێت ئەم دوورئەندیشییە و بەرژەوەند بینییەی سەرۆکەکانی حەوێزییان بەئیسپات دەگەیەنێ، چونکە ئایشەخان لەچاو وەزع و داب و دەستووری کۆیە هێندەی حەفسەخانی نەقیب و خانمی وەسمان پاشا بە دەسەڵات و قسە ڕۆیشتوو و بە شەخسییەت بووە، بەڵام زۆر نەژیا دوای حەماغا تا بزانین لەئاست براگەورە و وەکیلەکانی دوای حەماغا چۆن و چۆنی بەسەری دەبرد هەتا کاکەزیادی بۆ گەورە دەبوو. ئەوەندی ژییا بەدەسەڵاتەوە ژییا ئەجەلیش مۆلەتی نەدا لێمان مەعلووم بێ ئەو دەسەڵاتەی لە زیادبوون یان لەکەم بووندا دەبوو، بەڵام من لەو باوەڕەدام کە دەسەڵاتی هەرگیز کز نەدەبوو، چونکە جگە لە لێهاتوویی خۆی و پایەی بەرزی لای حەماغا دایکی تاقانە و جێگری

حەماغاش بوو کە ئەمە داروەکازێکی زۆر مەحکەمە بۆ ڕاست ڕاگرتنی باڵای شاژنێکی وەکوو ئایشەخان.

خاڵی دووەم ئەوەیە کە دەبێ سمایلاغا براگەورەی حەماغا بووبێ، هەر نەبێ لە دەلالەتی ئەو ڕاستییە کە حەماغا لەگەڵ قادراغای کوڕی سمایلاغا وەڵڵاش زاوا بووە، چونکە هەردووکیان سەرو کچێکی حاجی ئەسعەداغای حەویزییان مارە کردووە. وەڵڵاش زاوایی ئەگەر بەڵگەی بێ دەمەتەقەش نەبێ دەلالەتێکی هەر لێوەردەگیرێ، لێرەدا ڕاستییەکی دیکەش پاڵپشتی لەم دەلالەتە دەکات. مەلا ئەحمەداغای سمایلاغا لە ژیانی حەماغادا ئەوەندە بەساڵداچوو بوو ڕەنگە لەوەدا نەبووبێ بشێ حەماغا ئەو تەرزە کوڕە پیرەی لێچاوەڕوان بکرێ، چونکە جوداوازی تەمەن لەنێوان مەلائەحمەداغا و گەورەترین کچی حەماغادا کە ئەگەر بە خەیاڵ کچەکەمان بکردایە ئاوازی مەلائەحمەداغا لەوە دەردەچوو زادەی حەماغا بێ. ئێمە ئەگەر بسەلمێنین حەماغا دوای ساڵی 1257 ژنی هێناوە، وەک ساغمان کردەوە، ناشێ لە سەرەمەرگدا تەمەنی یەکەم منداڵی لە 59 ساڵ پتر بێ چونکە لە 1338 کۆچی دوایی کردووە. بە تەئریخی زایین ساڵەکانی یەکەم منداڵبوونی و مردنی 1861 و 1920 دەگرنەوە. وا دەزانم مەلائەحمەداغا لەدەمی مەرگی حەماغادا 60 ساڵی تێپەڕاندبوو قادراغا کە براگچکەی مەلائەحمەداغا بوو بەپێی نووسینی باوکم لە 1323 مردووە کە دەوەستێتە بەرانبەر 1905-1906 ز. ئنجا ئەگەر قادراغا لە 1280 هاتبێتە دنیا لەو ساڵەدا 43 ساڵی بووە، تا مەرگی حەماغا دەبێتە 57 ساڵی، دوو ساڵی بخەیتە سەر بۆ براگەورەیی لەو ساڵەدا تەمەنی مەلائەحمەداغا دەبێتە 59 ساڵ، هیچ یەکێک لە کچانی حەماغا لەو ساڵەدا ئەو عومرەی نەبوو.

خوێنەر بمبوورێ لەوەدا کە وردەکاری لە بابەتی وەها لابەلاییدا دەکەم. ڕاستییەکەی نامەوێ هیچ شتێکی گوماناوی، گرنگ بێ یا عادەتی، هەروەها بە ئاسانی لە ئەستۆی خۆمی دارنم چونکە کەمترخەمی لە شتی کەم دەکێشێتەوە بۆ کەمتەرخەمی لە شتی بایەخدار، ئێمەش لێرەدا نەهاتووین

بابەتی جیهانی ساغ بکەینەوە. تۆژینەوە لە ژیانی تاک بەناچاری سەر لە ساڵی بوون و ژن هێنان و چەندوچۆنی منداڵەکان و ژنەکانی و کەی و چۆن مردنی و ئەو جۆرە بابەتە بەرتەسکانە خوار دەکاتەوە منیش لەم وردەکارییەدا هەل ڕێک دەخەم بۆ کەسێکی بیخوێنێتەوە تا بتوانێ سەرنجی لێبگرێت و ئەگەر ئاگاداری شتێک بێ لەگەڵ بۆچوونەکانم ڕێک نەکەوێ بە خێری خۆی نووسینەکەم ڕاست بکاتەوە. ڕاستییەکەی زەینی بەنیئادەم ئەگەر شتی بۆ خوردنەکەیتەوە، بەزۆری، لێی دەتارێت و بەسەریدا دەخشێت.

دەتوانم بڵێم ئەگەر ئەو حەماغایەی وێنەی لە کتێبەکەی «دوو ساڵ لە کوردستان» بڵاو کراوەتەوە بە خەیاڵ بەرەو جحێڵییەوە ببەینەوە بە گەنجێک دەگەین لە لایەن هەڵکەوتنەوە بەتەمەن بووە، بەڵام لە لایەن پۆشاکەوە کەمتەرخەم بووە. لە وێنەکەوە دەردەکەوێ هەر وەک لە گێڕانەوەی دەماودەمیش بیستوومانە حەماغا پیاوێکی بەخۆوە بووە گوێشی نەداوەتە تیفتیفەی خۆڕازاندنەوە بە جل وبەرگی شیک و قەشەنگ. وابزانم بۆ لایەنی جلکان گوتەی خۆمانەی کوردی لێبەڕاست دەگەرێ کە دەڵێ: لە کوێ پسا لەوێی گرێ دەداتەوە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ مەشرەب و تەبیات، دەخلێکی کەمی بەسەر ئەوەوە هەیە کە حەماغا بە زۆری لەگەڵ ژیانی دەشت و دەردا خەریک بووە، چونکە زۆر سەرۆک عەشیرەت کە بەدەگمەن سەر لە شاردەدەن شیکپۆشن، گەنجی عەشیرەتیش بەعادەت تا بڵێی بە خۆیان و بە ڕەخت و زین و لغاو و بەرەو نەرمەزین و ئەو جۆرە کاروبارانەوە خەریک دەبن و بە خامۆشییەوە خۆیانی پێهەڵدەدەنەوە لەگەڵ ئەمەشدا بیستوومە حەماغا لەدەمی سواریدا چەکمەی لەپێ کردووە کە دەکاتەوە جۆرێک لە خەریکبوون بە پۆشاکەوە، بەڵام ئەو پۆشاکەی پێوەندی بەلایەنی دەستەوەکەری و ئامادەییەوە هەبێ بەکاتی لێقەوماندا.

کە دەڵێم حەماغا لەسەردەمی گەنجییەتیدا بە دەشت و دەرەوە خەریک بووە مەبەستم نییە گۆیا هەمیشە غەفووری خاوەن ملکی فراوان بوون لە زەوی وزار و ئاووبەراو، چونکە ئەوەی بزانم بەشێکی گەورەی ئەو ملکانەی

بەدەست حەماغاوە بوون خۆی بەکڕین پەیدای کردوون یان بە ئیجارە لە حکوومەتی گرتووە، زەوی و زاریکی خزمە مەیلەو دوورەکانی پەیدایان کردبێ دەخلێکی نییە بەسەر هاتوچۆی حەماغاوە بۆ دەشت ودەر. بەهەمە حاڵ غەفووری لەناو شار مڵکێکی ئەوتۆیان نەبووە، چونکە وا مەشوورە هەتا حاجی بەکراغا بەرحەیات بووە ڕێی نەداوە لەناو کۆیێ خاوەن مڵک بن تەنانەت دیوەخانی مەحموداغا کە بە میرات بۆ حەماغا ماوەتەوە هەروەها خانی مەحموداغا و قەیسەری و دووکانەکانیش کە مڵکی حەماغا بوون هەمووی دوای مردنی حاجی بەکراغا دروست کراون. لێرەدا بە موناسەبە حیکایەتێکی بچووکی سەر بەم لایەنەوەم بەبیردێتەوە. لە جیلی پێش خۆمم بیستووە جارێکیان لە دیوەخانەی حەماغا باسی ئەوە دەکرێ گۆیا بەشێکی شوورەی کۆیێ کە لە گەڕەکی هەواوان بەرەو خوارەوە بەپێوە مابوو حاجی بەکراغا تێکی داوە و بەردو خرچانەکەی لە خانووی خۆی بەکار هێناوە حەماغا بەدەنگ دێت و دەست دەبا یەخەی هەڵدەتەکێنێ و دەڵێ خوا شایەدە ئەم قسەیە فڕی بەسەر ڕاستییەوە نییە، ئێمە ئەو بەشەمان تێکدا بۆ ماڵ و دیوەخانەی خۆمان کە دوای مردنی حاجی بەکراغامان دروست کردن.

خوێنەر سەیری بەوە نەیەت کە حاجی بەکراغا توانیبێتی بەرهەڵستی بکات لە مڵکداربوونی غەفوورییەکان لەناو شاری کۆیێ ئەویش لەبەر دوو سەبەب:

یەکەمیان ئەوەیە غەفووریەکان دووای قەتلوعامەکەی 1237 لە کۆیە دوورکەوتنەوە تا دەوری 1250. لەو ساڵەشەوە تا مەرگی حاجی بەکراغا لە 1270 ماوەی 20 ساڵ هەیە کە بایی ئەوە ناکا تێیدا وەها بەهێز ببنەوە بتوانن بەربەرەکانی بکەن، لەناو شاردا، بەرانبەر حاجی بەکراغا.

دووەمیان ئەوەیە حاجی بەکراغا چەک و هێزی بەکار نەهێناوە لەو مەنع کردنەدا بەڵکوو بەپارەی زۆر و بە شەخسیەتی بێهاوتای توانیوەتی هەر مڵکێکی لەوانەبێ غەفووی بیکڕن ئەو بەنرخی زیادەوە بیکڕێ.

واپێدەچێ یەکەم کارێکی گرینگی حەماغا بە ئەستۆیەوە گرتبێ
ئەو «میرقەڵاتی» یان «ئاغادەربەندی» بووە. لەڕووی ناوی ئەو وەزیفەیەوە
دەبێ بڵێم بەڕێکەوت لێرەدا یەکیان گرتۆتەوە، چونکە شوێنی وەزیفەکە هەم
دەربەند بوو هەم کۆنە قەڵاتی پاشای ڕەواندزیشی لێبوو، ئەگەر ئەو کۆنە
قەڵاتە لە نێواندا نەبایە هەر دەمایەوە ناوی «ئاغادەربەند» جێنشینەکەی
پێوە هەڵبدرێتەوە قەڵاتیش هەیە بێدەربەند هەر «میرقەڵات» بەدەستەوە
دەدات.

حەماغا لەماوەی ئەو کارەیدا کەتنێکی کرد لێیبوو بە پنووکی ڕەشی سەر
جلکی سپی، چونکە ئەو جۆرە درِییەی لە تەبیاتدا نەبووە و دووبارەش
نەبۆتەوە، بەڵام سپیش نابێتەوە. جارێکیان مێوانی زۆر ڕووی لێدەنێن ئەویش
مەشوور بوو بە مێوان نەواز و شانازیشی پێوە دەکرد، لە تەمەنی
گەنجایەتیشدا وەکوو هەموو گەنجانی دنیا پتر بەخەمەوە بووە بۆ بێ عەیبی و
بێ کەموکەسری. گۆیا کە نان دەهێنن بۆ مێوانان، تا ڕادەی عەیبداری،
ناتەواو دەبێ. حەماغا زۆر بە خۆیدا دەشکێتەوە و دەچێتەوە بۆ دیوی ماڵێ
کە زڕدایکێکی سەرپەرشتی دەکات. لە ڕق و عەسەبییەتەوە و لە دمەقاڵێ
کە بەدوا ئەو عەسەبییەتەدا دێت زڕداکەکەی دەکوژێت. بەر لە تەواوبوونی،
زڕداکەکە پێی دەڵێ، تووکت لێناکەم ئەمما ئەوەندەم لە خوا دەوێ کڵاوسوور
لەدوواتەوە نەڕوا. واتە نێرینە لە دوواتەوە نەڕوا کە دەکاتەوە ئەوەی کوڕی
خۆی بە دووا خۆیەوە نەبینێ. زۆر بەسەیری ئەم سکاڵایە هاتە دی و حەماغا
هەرچەند لە کۆتایی ژیانیدا کوڕێکی بوو، بەڵام لە دوایەوە نەڕۆیی و لە ماڵی
خۆیشی بەخێو نەکرا. حیکایەتی ئەم مەسەلەیە دواتر دێت. نالەباری ئەم
ڕووداوە جگە لەوەی خۆی لە خۆیدا ئۆباڵێکی گەورەی پێوەیە لەگەڵ ئەو
تەبیاتەی کە حەماغاشی پێوە مەشوور بووە لە باڵقووڵی و تەحەمول و
لێبووردویی ڕێک ناکەوێ. ڕەنگە ڕاست بێ بگوترێ حەماغا ئەگەر ناچار
نەکرابێ زللەی لە نۆکەریش نەداوە چ جایی ئەوەی برینداری بکات
نەخوازەڵا بیکوژێت. لەزۆر کەسی ئەوتۆم بیستووە کە حەماغای دیتووە

دەیگێڕایەوە، قورسترین قسەی حەماغا کە لە تووڕەییدا بە دەستوپاوەندی خۆی گوتوە ئەوە بووە کە گوتوەتی قسەی لەوجڕ مەکە.

مناسبی جێگەیە کمێک لە ڕووداوێکی دیکەی وەک ئەمە بگێڕمەوە کە پێوەندی بە ئاکاری حەماغاوە هەیە. لەساڵی 1284ک. کە غەفووریەکان لەگەڵ عوسمانلی لێیان دەقەومێ و دەبێتە شەڕ و کوشتار و هەڵمەت و هەڵاتن حەماغا ترسی دێتێ خۆی و ژنێکی خۆی یەخسیر ببن. بەژنەکەی دەڵێ نابێ بکەوێتە دەستی هەیتەی حکومەت دەبێ بتکوژم. ژنە پێی دەڵێتەوە، دەمبینی چۆن خۆمم داپێچاوە و ئامادەی شەڕ و خۆ دەربازکردنم جارێ مەمکوژە، هەر کاتێکی زانیت دەستگیر دەبم گەردەنت ئازاد بێ سەرم ببڕە. حەماغا قسەکەی دەچێتە دڵەوە و ژنەکە بەسەلامەتی دەمێنێتەوە. هەر لەو هەڵاتنەدا حەماغا بریندار دەکرێ و دەسگیر دەبێ، بەڵام ژنەکە خۆ دەرباز دەکات. ئەو ژنە ئاغاژنە عەیشان بووە کە زۆر ژیا و بە پیری قسەی بەسەر حەماغاشدا دەڕۆییشت تا ئەوەی وەها دەبوو وشەی سووکی تێدەگرت و حەماغا لێی قەبووڵ دەکرد.

ئەم مامڵەت جوداییەی کە حەماغا لە نێوان زڕدایک و خێزانی خۆیدا کردی لە هیچەوە نەبووە. لە لایەکەوە حەماغا کە زڕدایکەکەی کوشت جارێ زۆر شلک و خوێنگەرم بووە، تا گەییشتە ساڵی 1284 نزیکی 10- 12 ساڵ تێپەڕ بووە و زۆر هەڵسوکەوتی زەمانەی لەو ساڵانەدا دیتووە هۆش و گۆشێکی تازەی پێداوە. لە لایەکی دیکەشەوە بایی ئەوەی هەستی کەمایەتی و عەیب هاندەر بووبێ ویستی ژنەکەشی بکوژێ، بەڵام وەڵامی ژنەکەی جێی خۆی کردۆتەوە لە قەناعەتیدا چ مەیلی خوێنڕێژیشی نەبووە دەرگەی دڵی دابخات بەرانبەر ڕاوێژی ژیرانە.

لەو ساڵەی 1275 ڕا کە باپیرم حەماغای بە ئاغادەربەندی دیت تا ساڵی 1284 کە تێیدا بریندار بوو، بەسەردا دەستگیریش بوو، چی ئەوتۆمان لە خەبەراتی بێگومانی حەماغاوە لا نییە دەماودەم یان لە نووسیناندا پێمان

گەییشتبێ مەگەر ئەوەی کە بڵێین وادیارە لەو ساڵانەدا برا بچووکێکی
بەرچاو و بەبرِشتی غەفوورییان بووە و ناو و شۆرەتێکی سەخاوەت و ئازایی
بەدووا خۆیدا هێناوە کە لە حاڵی حەبسبوونی لە بەغدا ئەو شۆرەتە
درێژەکێشانی رِۆژانی زووتری بووە نەک لە بەندیخانە وەکوو بلّقی سەرئاو لە
ناکاو بۆی رِەخسابێ. خەڵق ناتوانێ بە کۆت و زنجیرەوە لە ژووری حەبسخانە
بنیاتی سەخاوەتێکی حاتەمی هەڵبنێ، بگرە ئەگەر کەسێک بەر لە حەبسبوونی
یەکجار لەدڵاندا نەبووبێ مەتبەخ و قاوەجاغی لەکۆیەی بەر لە 100 ساڵەوە
بۆ رِاناگویزرێتەوە بەغدای سەردەمی عوسمانلییان بەتایبەتی بۆ یەکێکی
وەکوو حەماغا کە لە خۆ گەورەتری هەبووە لەتایەفەکەی چ باوکی بێت و چ
کەسانی دیکەی لە ئاموزا و هاوتەمەنانی باوکی بێت کە ئەگەر بە عادەتی بۆ
حەماغا هاتبانایە کایەوە دەبوو لەبیر خۆیانی ببەنەوە نەک رِەفتاری ئەوتۆی
لەگەڵدا بکەن وەک کە لەگەڵ سەرۆکی هەموو تایەفە دەکرێ. رِاستییەکەی
بە تەواتور زانراوە، لەو ساڵانەدا قورسایی سەرۆکایەتی غەفوورییان لەگەڵ
حەماغادا بۆ بەغدا بەرِێ کراوە. خۆ ئەگەر بگوترێ مەحموداغای باوکی ئەو
لەنگەرەی گەورەیی و پیاوەتیەی دەمی حەبسبوونی بۆ رِاگرتووە لەوەدا دوو
تێبینی دێنە پێشەوە:

یەکیان ئەوەیە زۆر لە گوماندایە ئەگەر مەحمووداغا خۆی حەبس کرابایە بێ
ئەوەی شەخسییەتی حەماغا پاڵپشتی بووبایە بیتوانیبایە مەتبەخ و قاوەجاغ لە
حەبسخانە قوت بکاتەوە بۆ ماوەی 15 ساڵ.

دوەمیان ئەوەیە کەوا چەند ساڵێک دوای مردنی مەحمووداغاش حەماغا هەر
لە بەندیخانە بووە چ کەمایەتیش نەهاتۆتە بەر سەخاوەتی. مەحمووداغا لە
هاتوچۆی بەینی کۆیە و کەرکووک و بەغدادا بۆ سەراسۆیی کردن لە
حەماغا گیانی سپارد. وەها دەردەکەوێ حەماغا بە ناسینی چەپ و رِاستی
خۆی هێزی رِاستینەی تایفەگەری رِووی لێناوە نەک بەدەسدرێژیکردن لە
خزمانی بەڵکوو بە هۆی لێهاتوویی خۆیەوە.

مەیدانی نماکردنی پیاوەتی و شۆرەتی حەماغا لە پەراوێزی جوغرافیایەکی بەریندا بووە. بەهۆی میرقەڵاتی و ئاغادەربەندی غەفووریيان لە دەربەندی ڕەمکان بەولای وڵاتی بیتوێن و ڕانیە و مەرگە و پژدەر و دیوی کوردستانی ئێرانیش هەتا مەڵبەندی سەردەشت و لای مەهاباد و خوارووژوورتریش گوێبیستی نان و خوان و دەستوقامی حەماغابوون. لە دیوی عێراق بە دەوروپشتی وڵاتی کۆیەدا، چەندی بڵێی، لە کوردستاندا خەڵقەکە حەماغای ناسیوە. لەو هەرێمە پان و بەرینەدا حەماغا چ بەپێی تەبیاتی مەردانەی خۆی بووبێ و چ لەبەر ناچاربوون بەدەست موراجەعەی لێقەوماوان و بڕیاری واقیع و ڕووداوی زەمانە بووبێ مەشقی سەخاوەت و بەهاناهاتن و دەسخاوێنی و ئاوەدان کردنەوە و خزمەتگوزاری کردووە. مەرد هەیە لەبەر تەسکیی مەودای تێدا خولانەوە ڕێی نابێ بایی هەموو مەردایەتیەکەی دەربکەوێ، وەکوو کاکڵەگوێز لە قەپێلکەکەدا دەمێنێتەوە. هەرچی حەماغا بوو دەرفەتی گەلێک گەورەی هەبوو بۆ خۆ دەرخستن و شۆرەت پەیداکردن تا ئەوەی دەڵێم ئەو دەرفەتە سەبارەت بە تەبیاتە لەڕادەبەدەرەکەی ڕووەو جوانمەردییەوەی باری زێدە قورسی دەخستە ئەستۆی خزمەتگوزاری و مێواننەوازی و بەهاناهاتینەوەی لەزۆر باردا سەغڵەتیشی بۆ پەیداکردووە. هەر چونکە فەرق و جودایيشی لەنێوان مێوانی دەوڵەمەند و هەژاردا نەکردووە و خوانی هەموویان وەکوو یەکدی بووە، خۆیشی پارووی لەدیوی ماڵەوە بێ مێوان نەخواردووە، خوا هەرچییەکی بە قیسمەت کردبێ لە خواردەمەنی ئەوە هاتووە بۆ سەرلەبەری مێوانان. دەشێ بڵێم حەماغا ئەو دەوڵەمەندە نەبووە کە ڕەنگبێ بەخەیاڵاندا بێت. لە ڕووی مڵکدارییەوە هەرچەند بێ مڵک نەبوو بەڵام هێندەشی نەبوو وەک بەگزادەی جاف بتوانێ بەدرێژایی ساڵ ڕۆژانە خواردنی مومتاز بەلێشاوکەی مێوانان بدات. ئەگەر هاتبایە خوانی پیاوماقووڵانی لە زۆربەی بۆرەپیاوان جودا کردبایەوە بۆی دەلوا ڕۆژانە بریانی و برمە و پەقڵاوە لەسەر سینی برازێنێتەوە. کە وەهای نەکردووە و یەک خوانی هەبووە بۆ هەموان دەماری پیاوەتیەکەی لێرەشدا یارمەتی داوە کە

شەرمی نەهاتۆتەوە لەوەی ڕەشەشێوی وەکوو نیسک و ماش لە دیوەخانەکەی هەڵبقورێنن خۆیشی لەگەڵیاندا.

حەماغا پارسەنگی مڵکدارییە لەنگەر بەزیوەکەی نەدەچووە تای تەرازووی مەسرەفە قورسەکەیەوە لەڕێگەیەکی ئابووری دیکەوە پارسەنگی دەدایەوە. هەتا بڵێی مەڕی بەخێو کردووە و لەپەروەردەکردن و ئاگالێبوونی خەریک بووە. من لە باوکم بیستووە دەیگوت دە هەزار سەرمەڕی هەبوو، لە غەیری ئەویشم بیستووە کە پتری هەبووە. ئەم مەیلەی بۆ مەڕداری کە شۆرەتی بەستبوو بەقەدەر شۆرەتی سەخاوەتەکەی، بووە بنەمای ئەو حیکایەتە بێ درۆیانەی باسی بەخشندەیی حەماغا دەگێڕنەوە لە بەخشینی ڕانەمەڕێک بە فڵانەکەسی وڵاتی عارەبان یان هەندەران کە کاتی خۆی بە مەڕی حەماغا مێگەلی پێکەوە ناوە. ساڵانە مەڕ و بەرخێکی کەسروکەترە و شەلوپەل هەبووبێ لەمێگەلەکانی لای خۆی کۆی کردوونەتەوە و دەرمانی کردوون هەتا ساغ بوونەتەوە ئیتر بە شوانێکی تازەی سپاردووە و بۆی بوون بە مێگەلی نوێ. دەگێڕنەوە ئەو ڕۆژەی غەفوورییەکان شەڕێکیان لە دێی خدران دۆڕاندبوو زەرەری قورسیشیان لێکەوتبوو هەموویشی هەر لە حیسابی حەماغا بوو، حەماغا دوای بیستنی شکست و زەرەرەکە بە عادەتی خۆی خەریک دەبێ دەرمانی چەند مەڕێکی کەترە دەکات. یەکێک خۆی ناگرێ و دەڵێ، ئاغا وا دنیا وێران بوو بەسەرماندا تۆ خەریکی مەڕی کلک ڕیخاویت. ئەویش لەسەرخۆ پێی دەڵێتەوە بۆچی ئەم زەرەرەش بچێتەوە سەرزەرەری گەورە؟ مەڕی بەستەزمان چ گوناحی هەیە لە شکستی خدران... بەردەوام دەبێ لەتیمارسازییەکەی...

مەڕداری ی حەماغا بەناچاری دەکێشێتەوە بۆ خەفتیانی ئاو و پاوانی ئاژەڵ. تۆ کە پووش و پاوانت نەبوو مەڕداریت پێناکرێ، تەنانەت ئەگەر بەعینادی لە ماڵەوەش بە ئەڵەف بەخێوی بکەیت هەر مەڕەکانت لێ دەمرن، چونکە وەک کە پێویستی بە ئاو و ئالیک هەیە پێویستی بە گەڕان و بە بەرۆچکە و هەوای دەشتودەریش هەیە، لەو زەمانانەدا کە حەماغای تێدا دەژیا مەڕ و

ئاژەڵ بە تێکڕایی لە کونی ژوورەوە زاووزیشیان پێنەدەکرا، خۆ ئەوسا خانەی بەکوندیشنی ئەم ڕۆژگارە نەبوو وڵسات و پەڕەووڵ تێیدا بحەسێتەوە و زیادیش بکات. ئنجا بە شێوەیەکی کە پێی دەڵێن «الی» مەڕداری پاوان بەدوا خۆیدا ڕادەکێشێ لەو ڕووەوە بوو بەشی هەرەزۆری پاوانی ڕیزەشاخی هەیبەسوڵتان هەتا دەگاتە زێی کۆیێ «زێی گچکە» تەرخانی مێگەلەکانی حەماغا و شوانکارەکانی بوون کە لەو مێگەلەی بەخێویان دەکرد شەریکی حەماغا بوون. ئەو شوانکارانە زۆربەیان لە عەشیرەتی مەنگوڕ و «خدرمامە سێنی» بوون کە وابزانم ئەوانیش هەر سەر بە مەنگوڕانن. ساڵانە گەڕمێن و کوێستانیان پێکردوون، لە زستاندا ئاوایی بۆ خەڵقەکە و کۆزێش بۆ مەڕەکان لەچەندین جێگەی بناری شاخی هەیبەسوڵتان بەدیوی کۆیەدا سازدراوە. لەمانە ئاودەلۆک و سوێرەڵە و پێنگاو شوێنی ناسراون. پێنگاو لە نزیک دێی کلێسە بەسەر زێی بچووکەوەیە.

لەو شەراکەتەی کە حەماغا لەگەڵ شوانی مەنگوڕانی کردووە بەرژەوەندێکی گەورەی مەڕ بەخێوکردنی ڕەچاوکردووە. هاتوچۆی مەڕی وەها ئەستۆور بەرەو کوێستان داخوازی کردووە بە درێژایی ڕێگە لەناو دۆست و ناسیاودا تێپەڕێ دەنا لە زەحمەت زەحمەتترە هەموو ساڵێک سەلامەتی ئەو زیندەماڵە تەئمین بکرێ، لە کوێستانیش گوزەرانی مەڕ و شوانکارە مەیسەر نابێ ئەگەر شوانکارەکان خۆیان خەڵقی ئەو ناوچەیە نەبن. لەکۆیەوە هەتا دەربەندی ڕەمکان «سەنگەسەر» لە دەسەڵاتی حەماغا و غەفووریياندا بووە کە هەر خۆی و خزمانیشی ئاغادەربەند بوون. لەوە بەولاوە بەرەو کوێستانی شاخەبەرزەکانی ڕیزەی قەندیل دەسەڵاتی غەفووریيان کۆتا دەبێ. خۆ ئەگەر دەسەڵاتیش هەبێ مەڕ بەخێوکردن بەزەبری کوتەک و لوولەی تفەنگ لەو شاخە سەرسەختانەدا کاری عەقڵ نییە. گریمان ساڵێک و دووانیش ئەو کوتەک کارییە خۆی سەپاندو مەڕی دامەزراند، ئەدی بۆ ماوەی 15 ساڵ و 20 ساڵ لەکوێوە ئەو هەموو دەسەڵاتە بەگژ ئەرز و ئاسماندا بهێندرێ؟ لەوەش بترازێ، خۆ بابای مەڕدار بەتەمای کەسابەتە نەک ئیقلیمگیری،

بەتەمایە شیر بدۆشێت و ماست و کەرە و پەنیر بفرۆشێت نەک شەڕناخێوی و جلیتبازی بکات.

وادیارە لەو سالانەی کە غەفووری میرقەلات و ئاغادەربەند بوون بە نیازی بەرژەوەندبینی و کاردروستایەتی و لە خۆئەمین بوون دۆستایەتییان لەگەڵ مەنگوڕان بەستووە کە بەدیوی پژدەردا یەکەم جیرانی بەهێز و بە سامانی ولاتی ڕانیەن. لە دەربەند بەدیوی ڕۆژهەلاتدا زۆر نابا دەگەیتە سنووری مەنگوڕان، بەناو مەنگوڕیشدا دەڕۆیت بۆ ئەو کوێستانانەی کە لە زنجیرەی قەندیلەوە بەرەو باشووری ڕۆژهەلاتدا ڕیز دەبەستن تەنانەت کە زنجیرەی قەندیل گەییشتە پێچی شاخی گەلالە، «گەلاڵەی قەندیل جودایە لە هی باڵەکایەتی»، «بەرزترین لووتکەی مەشوورە بە کوڕەش بەرزاییشی 3100 مەترە» پێی دەڵێن قەندیلی مەنگوڕان و کوڕەش خۆی لەماوەی دوو سەعاتە ڕێگایەکەوە بەسەر دێی شەروێت و ئەو مەزرایەی مەنگوڕایەتیدا دەنۆڕێ.

واپێدەچێ دۆستایەتی غەفوورییان لەگەڵ مەنگوڕاندا کە لە نووکەوە ڕووەو بەرژەوەند و دەولەتپارێزییەوە بووە، سەری کێشابێتەوە بۆ فەلاکەتی هەرەگەورەی کە دوای قەتلوعامی 1237 دووچاریان بووبێ. سەرگوزشتەی ئەم فەلاکەتە بەم جۆرەیە.

لە 1284 تەقیەدین پاشای والی بەغدا بەنیازی سەرکوتکردن و گرتنی هەمزاغای مەنگوڕ بەهێزێکی گەورەوە مل دەنێ بەرەو کوردستان. ئەوسا ڕێی کونەکۆتر کە لە دوکانەوە بەرەو بیتوێن تێدەکا ئەوە نەبوو سپای حکوومەت بەتۆپ و عەرەبانە و جبەخانەیەوە لێیەوە تێپەڕێت. تەنها ڕێگەیەک بووبێ لە بەغدا و کەرکووکەوە سپای لێوە بڕوا بەرەو بیتوێن و پژدەر ڕێگای کۆیە بووە. پاشا دێتە کۆیێ و خێوەت و خەرگا لەو شوێنە هەڵدەدا کە پێی دەڵێن «قەبری فەقێ» جێگایەکە بەسەر ئەو یەکاوەدا دەنۆڕێ کە ڕووباری کۆیە و ئاوی «سوێراوان» تێک دەکەنەوە. ئێستا ئەو یەکاوە پردی ڕێی ڕانیەی بەسەرەوەیە و لەوچەند سالانەدا بە زیادکردنی شار ئەو یەکاوە و

قەبری فەقێش کەوتوونەتە ناو ئاوەدانی. بەهاتنی پاشا بۆ کۆیێ غەفووری ترسیان لێدەنیشت و پیاوە بەرچاوەکان لەشار دەردەچن. پاشا بۆ بەڕێداچوونی تۆپ و عەرەبانەکانی ڕێگەی کاروان کە شاخی هەیبەسوڵتاندا دەڕوات پانتر و هەموارتر دەکات و پلەکانی دەتاشێت. خولاسە خواوڕاستان پاشا بۆی دەلویێ هەمزاغا دەسگیر بکات. لە گەڕانەوەدا سەرلەنویێ بەکۆیەدا دیێتەوە و بەناوی حەسانەوە وەها ڕادەنوێنێ کەوا چەند ڕۆژێکان لە کۆیێ دەمێنێتەوە غەفوورییەکان لە گوندی «میر سەیید» کە لە نەدیوی کۆیێ بەقەد شاخی هەیبەسوڵتانەوەیە «لەو شوێنەدا ڕیزە شاخەکە ناوی میرسەیید و فەقێیانی پێوەیە» خۆیان دادەنووسێنن و گوێگری سرکە و کورکەی حکوومەت دەبن.

تەقیەدین پاشا بە ئاشکرا هیچی وەها ناکات و نالێت غەفووری لێی بسڵەمێنەوە بەڵام وەک لە ئاکامدا دەرکەوت لەبنەوە خەریکی پلان بووە. وەها مەشوورە کە ئافرەتێکی بەد عەمەلی کۆیێ و لەبەر بەدایەتی پێی گوتراوە «کەسکەفەندی» خەبەر بە حکومەت دەدات کە غەفوورییەکان لە میرسەیید خۆیان حەشار داوە و شەویش هەر لەوی دەخەون

پاشا بە کاردروستایی تەواوەوە شەوێکیان شەبەیخوونیان بەسەردا دەدات و غافڵگیریان دەکات. لە پێشەوە تا بۆی مومکین بووبێ دەوری گوندەکە ئابلووقە دەدات ئنجا هرووژم بۆ خەڵقەکە دێنێت. لەو شەڕەدا کەوا هەتا بەیانی بەردەوام بووە سمایلاغای براگەورەی حەماغا دەکوژێت. حەماغا بۆی ڕێک دەکەویێ قاتڵی براکەی کە ئەویش هەیتەیەکی «سمایل اغا» ناو بووە بکوژێت، بەڵام خۆیشی شمشیرێکی بەر بناگویێ دەکەویێ و پێیەوە ئەسیر دەکرێ ئەو برینە هەتا مردنی هەر خووزاوی لێهات و هەرگیز بنەبڕ نەبوو. ئەغڵەب پیاوە گەورەکانی غەفووری دەرباز دەبن، چونکە شوێنی گوندەکە وەها هەموار نییە بەتەواوی دەوری بگیریێ. دەڵێن مەحمووداغای باوکی حەماغا ماوەیەک حەبس دەکریێ و بەرەڵڵا دەکریێ، دەشڵێن مەحمووداغا حەبس نەکراوە.

بەهەمەحاڵ کەس نازانێ ئەگەر حەبس بووبێ چۆن بەردراوە ئەگەر حەبسیش نەبووبێ چۆن خاڵە بەخش کراوە. ڕیوایەتێک هەیە دەڵێ کەریماغای برای مەحمووداغا کە دەکا مامی حەماغا، ئەویش لەو شەڕەدا بەدیل گیراوە، بەڵام لەگەڵ هێندێ وردە حیسابی نێوان بەرەبابی حەمەداغا «کە باوکی کەریماغا و مەحمووداغایە» ڕێک ناکەوێ. وەها مەشوورە دیوەخانی مەحمووداغا کە بۆ حەماغا مایەوە کەریماغای مامی دەستی پێکرد و بەسەردا مرد ئیتر مەحمووداغا تەواوی کرد. مێژووی ئەو دیوەخانەیە لەسەر بەردە مەڕمەڕێکی بان دەرگای ژوورێکی، 1271ک. نووسراوە بەو پێیە کەریماغا دەبێ لە 1271 کۆچی دوایی کردبێ. ئەم لێکدانەوەیە و مێژووی «1271»ی بێ فێڵ لەگەڵ قسەیەکی ناو کتێبەکەی «دوو ساڵ لە کوردستان»یش ڕێک دێت کە دەڵێ دوای مردنی حەماغا ئامۆزاکەی کە ڕەسووڵاغای کەریماغایە پێیداگرت لەسەر ئەوەی کە دیوەخانەکە میراتی ئەوە و دەبێ پێی بدرێتەوە بە نامەی هێندی کە باوکی ئەو دەستی بە دروستکردنی کردووە و پاش مەرگی ئەو مەحمووداغا لێی بووە بە خاوەن. بە هەمەحاڵ کەس لە ڕەسووڵاغای نەسەلماند و دیوەخانە وماڵەکەی مەحمووداغا کە حەماغای تێدا بوو بۆ کاکەزیادی تاقانە مایەوە، لەوەشڕا دابێکی کۆن و بەرژەوەندێکی گرنگی بنەماڵە ڕەچاو کراوە، چونکە ئەگەر دیوەخانەی براگەورە لە دوا مردنی دارەبەش کرا بەسەر میراتگراندا کەس ناتوانێ دوای پەرتبوونی سامانی براگەورەی مردوو بە کەرتە میراتی خۆی لە نوێ دیوەخانەی سەر لەبەر بنیات بنێ خۆ ئەگەر بە ڕێکەوت جارێکیان میراتگرێک ئەمەی پێکرا هەموو جاران کەرتە میرات بەشی مەسرەفی وەها قورس ناکات. لە حاڵ وباری ئەو ڕۆژگارانەدا هەر وەک سەرای حکوومەت میراتی ئەو کەسەیە کە دەبێتە سەرۆکی مەئمووران هەتا دەمرێ یان ڕادەگوێزرێ دیوەخانە و پشکی براگەورەیەتی لە میراتی بنەماڵەش دەبووە هی ئەو براگەورەیەی کە جێی سەرۆکی کۆچکردووی دەگرتەوە قسەکەشم لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی وەزعی لێرە بە پێشەوەیە نەک

کە مەبەستمە پاتەوپات بڵێم سەرای حکوومەت میراتی قائیممەقام و پارێزگارە.

حەماغا بە برینداری و بە دیلی دەبردرێ بۆ کەرکووک ئیتر یا لەوێ 15 ساڵ حوکم دەدرێ یان دوای گوێستنەوە، بۆ بەغدا. واپێدەچێ دادگای سپایی یان عورفی ئەو حوکمەی دابێ نەک دادگای مەدەنی، چونکە سەرلەبەری ڕووداوەکە لەلایەن والی و سەرۆک سپاوە سازدراوە و بە کۆتایی گەیشتووە ئیتر لە کوێوە قازی شەرع دەستی بەسەر موحاکەمەی ئەو تۆوە ڕادەگات!

دەماودەم هاتووە، بەینێک حەماغا و هەمزاغای مەنگوڕ لەیەک بەندیخانەی بەغدادا بەسەر دەبەن. دیارە هەمزاغاش هەر بە دواگیرانی لەلایەن والی تەقیەدین پاشاوە بردراوە بۆ بەغدا. بیستوومە، ڕاستییەکەی لە خاڵە جنێدم نەقڵ دەکرێ، کە لە ماوەی بەیەکەوەبوونیان لە بەندیخانەی بەغدادا، حەماغا و هەمزاغا لە دمەقاڵییەوە دەگەنە شەڕە چەپەڵۆک. خەبەرەکە وەها هاتووە کە حەماغا لە هەمزاغا دەدات، ڕێشی تێدەچێ وەها بووبێ، چونکە حەماغا لە تەمەندا گەنجتر بووە ڕەنگە بە لەشیش تەنومەنتر بووبێ.

هەمزاغا لەو دەمانەدا کە لە کوردستانی عێراق بە دیل گیرا پێشتر لە دیوی کوردستانی ئێران دەژیا وەک دواتریش چۆوە دیوی ئێران و لە ساڵی 1297 [188ز.] هەراگەورەکەی دژی ئێران نایەوە بە هاریکاری شێخ عوبیدوڵڵای نەهری. هاتنی بۆ دیوی عێراق هەر لەبەر نانەوەی هەرا بووە دژی شای ئێران، دیارە ئەو هەرا نانەوەیە تەمەنێکی مەیلەو کامڵی دەوێت و بە تێشکانیش ناچار بووە پەنا بۆ دیوی عێراق بهێنێ کە بەشێکی ئێلەکەی لێ دەژیا، ئەو پەناهێنانەشی دەبێ بە چاوپۆشیکردنی عوسمانلی بووبێ، سەیریش نییە والی بەغدا پاش چەند ساڵێک لەو پەناهێنانەی هەمزاغا کەوتبێتە سەر خەیاڵی تەنبێ کردنی، چونکە زۆر ئاشکرایە هەمزاغایەکی شای ئێرانی سەغڵەت کردبێ ئەو ڕێ بەدییەی پێناکرێ کە والی بەغدای لێڕازی بێ. بەهەمەحاڵ لێرەدا کارمان بە باسی هەمزاغاوە نییە خوای لێخۆش بێت و

تۆڵەی بۆ لە زاڵمانی قاجاری و عوسمانلی بسێنێ. جارێ لە سەر گوزەشتی حەماغا مەبەستمان تەنها زانینی چەندوچۆنی و هەڵسوکەوتی زانراوی ژیانیەتی هەتا ئەو ڕۆژەی بۆ دوایین جار سەردەنێتەوە مەسەلەی ئازایەتی و سەخاوەت و حەقدۆستی و وەفاکاری و ئەو جۆرە خەسڵەتانەی کەوا بەشێکی ئاشکرای بەر ڕۆژانی بەندییەتی بەغدای دەکەوێ هەڵدەگرین بۆ پاش لێبوونەوە لە گەشتی ژیانی.

حەماغا پازدەساڵی ڕەبەق، بێبەخشین و لێکورتکردنەوە لە بەندیخانە بەسەر دەبا برینەکەی کە هەتا کۆتایی ژیانی لەگەڵیدا ژیا، بێگومان، لە دەردی بەندیخانەکەی زیاد کردووە ناشزانین حکوومەتی ئەوسا چۆن ڕەفتارێکی لەگەڵ حەبسی بریندار کردووە. ئایا دکتۆری بۆ هێناوە یان ڕێی داوە لە لایەن پسپۆڕی خۆرسکەوە دەرمان بکرێ یان لێگەڕاوە برین بەرەهایی کاری خۆی بکا بێحەکیم و بێدەرمان، بەڵام لێرەدا ئینساف لێمان داوا دەکا وردبینییەک بەکار بهێنین و ڕاگەیاندنێکی لێوەربگرین. بەتەواتور هاتووە حەماغا لە حەبسخانە نان و خوانی هەمیشەیی هەبووە، لە خزم و کەس و ناسیاوی غەفووریانیش زانراوە کە خوشکی خۆی، خێزانی ڕەسووڵی کەریماغای ئامۆزای حەماغا، بە درێژایی ساڵانی حەبسبوونی لە بەغدا مەتبەخچی و چێشت لێنەر و بنەوانی قۆناغی بووە جگە لە چەند دەستوپاوەندی دیکە کە ئەرکی پێداویستی ئەو لوقنتەیەی ناو حەبسخانەیان هەڵگرتووە. ئەو خوشکەی حەماغا کە ناوی زبێدخان بوو تا دووای 1930 یش ژیاو زۆر لە زیندووانی ئەم سەردەمە حیکایەتی ڕۆژانی بەغدایان لێبیستووە. ئنجا کە مومکین بووبێ بۆ حەماغا بەو جۆرە تاقم و تەداروکەوە لە حەبسخانەدا سەخاوەتی خۆی بەجێهێنابێ دیارە بە ئاسانی توانیویشیەتی بۆرە حەکیمێک پەیدا بکا بۆ دەرمانی برینەکەی، حکوومەتیش هەروەک ڕێی داوە پڵاو و شیلانی لە حەبسخانەدا دڵدەرەوەی حەبسەکان بێت ڕێشی داوە بەپێی ئیمکان لە تەندروستی خۆی بخەفتێ.

قسەیێک لەو زبێدخانە دەگێڕنەوە دەنگدانەوەی جۆرە باوەڕێکی قووڵی کۆنینەیە. گوتبووی لەو ڕۆژەوە کە کاکم «واتە حەماغا» لە میرسەیید کاکۆڵیان گرت و بەو کاکۆڵە ملزەمیان کردو شیرێکیان لێدا پرچ و کاکۆڵ لە غەفوورییان حەرام بووە. وابزانم هەر لە ڕووداوێکی وەها بە دیومی ئەو سەردەمانەوە ماوەتەوە کە غەفووری لە جەژنەدا چێشتی برنج لێنانێن، دەڵێن بەپڵاو ساوار جەژنە بەڕێ دەکەن.

دوای 15 ساڵ بەندیبوون، لە ساڵی 1299ک. و لە تەمەنی 45 ساڵەییدا، حەماغا بەرەو کۆیێ هاتەوە لە برایان تەنها حەسەناغا مابوو کە برابچووکی بوو وەک گوتمان مەحمووداغای باوکی لە هاتوچۆی سەردانی حەماغا لە کەرکووک نەساغ دەبێت و ئەمری خوا بەجێدەهێنێ، پێشتریش لە 1271 کەریماغای مامی مردبوو ئیتر بە لێهاتوویی خۆی و بەداب و دەستووری تایەفەگەریش خۆی دەبێتە جێگری باوکی. هەرچەند لە تایەفەی غەفووری پیاوی لەو بە تەمەنتر و لە پلەشدا لەو هەڵکشاوتر هەبوون کە ئامۆزای باوکی بوون، بەڵام لەلایەن سەرۆکایەتی ڕاستەقینەوە هەموویان سەرۆکایەتی حەماغایان سەلماندبوو. پێی ناوێ من بڵێم لەخۆوە ئاشکرایە کە حەماغا لە بەندیخانەوە براگەورە بوو.

لە ئاست حەوێزییان بیستوومە بە بیستنێک کە گومانی لێنەکرێ، دوای مەرگی حاجی بەکراغا تێکڕای غەفوورییان بەرانبەر ئەميناغا «ئەختەر» ئەو ڕێزەیان ڕەچاو دەکرد کە بۆ حاجی بەکراغا ڕەچاو دەکرا. دوای مەرگی ئەميناغا غەفووری دەریان بڕیبوو ئەگەر کاکەفەندی «کوڕە گەورەی ئەميناغا» لە شوێنی باوکی دابنیشێ بەچاوی باوک و باپیری تەماشای ئەویش دەکەن، بەڵام خزمە دەسەڵاتدارەکانی کاکەفەندی ئەم قسەیەیان هەڵنەگرتەوە. لەوە بەولاوە مەسەلەی پێشکەوتن و لەسەرەوە دانیشتن بوو بە کاری ململانێ و کێبەرکێ لە نێوان حەوێزی و غەفوورییان، لزومیش نابینم ئەم مەسەلەیە ورد بکەمەوە هەرچەند باشیشی لێئاگادارم خوا لە هەموان خۆش بێ.

دابڕانی حەماغا بەدوا کارەساتەکەی 1284ک. دا لە حاڵ و باری وڵاتی کۆیێ بۆ ماوەی پازدە ساڵ تەرازووی دەسەڵاتی ئەم بەر و ئەو بەری زێی بچووکی بە تێشکانی بەری کۆییدا لەنگاند بوو. لەو کتێبەی «دوو ساڵ لە کوردستان» کاپتن های نەختێک یارمەتیمان دەدا بۆ چۆنیەتی ئەو دالەنگانە بێ ئەوەی بیبەستێتەوە بە بەندیبوونی حەماغا هەر ئەوەندە دەڵێ بۆ بەرگریکردن لە دەسدرێژی هەمەوەندەکان حەماغا دۆستایەتی لەگەڵ شێخ بزێنییان گرت تا هەمەوەندەکانی پاشگەز کردنەوە ئەمجار کە ئاغایانی شێخ بزێنی لە پیت و بەرەکەتی دەشتی کۆیە چەشەخۆر بوون، تەمایان لە وڵاتەکە ناو خەریکی خۆ چەسپاندن بوون. ڕاستییەکەی بە خۆ چەسپاندنیش ڕازی نەبوون کەوتنە سەر ڕەوهێنان و تاڵانکردن و ڕێ بە خەڵق گرتن تا گەیشتە حاڵێک جارێکیان لەبن دیواری شاری کۆیێ ڕاووڕووتیان کرد. ئەم کێشمەکێشەی نێوان حەماغا و شێخ بزێنییان دوای دەرکردنی هەمەوەندان هەتا دەوروبەری 1230ک- 1912ز. بەردەوام بوو کە پتر لە 25 ساڵ دەگرێتەوە. مێژووی باسکراوی 1230ک. لەوەوە دێت کە شکاتی زێدە گرنگ و سەخت و پڕ جورئەتی ڕەسمی لەلایەن حەماغاو دۆستانیەوە دژی شێخ بزێنیەکان پاش مەرگی حاجی مەلاعەبدوڵڵا بووە، واتە پاش 1910ز بووە کە دەکەوێتە بەرانبەر 1228ک باسی ئەم شکاتەش نەختێکی دیکە نۆرەی دێت وەی کاشکی کاتی خۆی وەک لە زاری بابمەوە بیست بمنووسیبایەوە. دەسدرێژی شێخ بزێنییان بە زۆر کەوت لەسەر کۆیە و لەسەر حەماغاش هێشتان هەرا تازە سەرپێکی خۆش دەبوو شەڕێکی کە لە دێی شەوگێر ڕوویدا حەسەناغای برای حەماغا کوژرا دەڵێن تفەنگێکی دوورهاوێژ لە عەوڵا ناوێکی کە بە ئەسڵ خەڵقی وڵاتی کۆیێ بووە و ڕۆیشتووە بۆ بەری قەڵاسێوکەی شێخ بزێنی ئەو خوێنە زلەی ڕژاند. ئنجا ئەگەر لە بری کۆنە تۆڵەی خۆی بەگەڵ دوژمنەکانی وڵاتی کۆیێ کەوتبێ یاخود بۆ پاتاڵ خۆری ملی لێناوە یان بەهەر نیازێکی دیکە بێ، لێرەدا بەدوا

دۆرینەوەی ئەنگوستیلەی شرایەوەی کارەمستێنیٚ ناکەوین دابزانین ئەو کابرایە چی لە دڵدا بووە خۆی و نیازەکەی بەهەناوی خاک دەسپێرین.

وەها ڕێک دەکەویٚ جەمیلاغای حاجی ئەسعەداغا کە زێدە مەسرەفی بەملدا هاتبوو لە دوای مەرگی باوکی، میراتیشی بەسەر چەندین میراتگردا دابەش بووبوو ئیتر پشکی براگەورە بایی مەسرەفی دیوەخانەی نەدەکرد سەرەڕای ئەوەی کە جەمیلاغا خۆی بە تەبیات حەزی لە سەخاوەت و میوانەوازی دەکرد ئا لەبەر ئەم هۆیانە جەمیلاغا دێیەکی خۆی کە عومدەدیٚ بوو لە دەشتی کۆییٚ و مەشوورە بە «خرابە» فرۆشتییە تۆفیقاغای شێخ بزێنی حەماغا کە بەم مامڵەتەی زانی بەدوا جەمیلاغایدا نارد و پارەکەی پێداوە و دێیەکەی بۆ خۆی هەڵگرتەوە و پارەی تۆفیقاغا بۆ خاوەنی چۆوە. حەماغا خوارزایەکی خۆی لەسەر دێیەکە دانا کە زاواشی بوو لە هەرای شێخ بزێنییان دێی خرابە هەم لەبەر نزیکی لە زێی گچکە کە سنووری نێوان وڵاتی کۆیە و هەرێمی شێخ بزێنییانە و هەم لەبەر چالاکی و ئازایی ساڵحاغای «صالح اغای» خوارزا و زاوای حەماغا دەورێکی گەورەی هەبوو لە بەرگری و لەبەرەو پاشکردنەوەی شێخ بزێنییان، ساڵحاغا کوڕی عەبدوڵلاغای ئەبا بەکراغای عەبدوڵلاغای غەفووراغایە. حەماغاش کوڕی مەحمووداغای کوڕی حەمەداغای کەریماغای غەفووراغایە و دەگەنەوە یەک، پێویستە لێرەدا پیاوەتی و ئازایەتی و دەوری زێدە بەرچاوی کوێخا محەممەدی پێبازۆک بکەم کە بەدرێژایی ئەو کارەساتانە گەورەترین یاریدەدەر و پاڵپشتی ساڵحاغا بوو. لە شەڕە هەرە کوشندە و بە ئەرکەکان بەشداری کردووە تەنانەت دەگێڕنەوە جارێکیان شێخ بزێنییەکان هەل لەوەدا وەردەگرن ساڵحاغا بە ئیشێک چۆتە دەرەوەی خرابە، ئیتر هرووژم دێنن بۆ ناو دێیەکە و خەریکی ڕاووڕووت دەبن ساڵحاغا کە بەمە دەزانیٚ بێوەستان تەقڵەکوت بۆ ناو ئاگربارانی ئەو دەمەی دێیەکە دەڕوات گوللەیەکیشی بەردەکەویٚ کوشندە نابیٚ و بە بریندارى ئەم داگیرکەرانە دەردەکات. ئا لەو شەڕەدا کوێخامحەممەدی لەگەڵدابووە. ساڵحاغا هەتا مرد ڕێز و وەفای بۆ

کوێخامحەممەد هەبوو کوێخا خۆی یەکێک بوو لە چەند کوێخا و پیاو ماقووڵی گەورە بەرچاو و خاوەن دیوەخانی دەشتی کۆیە لە نێو براگەورانی کۆیێ پایە و ڕێزی تایبەتی بۆ ڕەچاو دەکرا خۆی و خزمانی لە دێی پێبازۆک کە هی جەلیزادان بوو دادەنیشتن، بەڵام زەوی و زاریان لەو بەری ڕووبارێکی کە پێی دەڵێن دوو شێوان هەڵکەوتبوو ناوی زەویەکانیان بە «ئاوەزێ» و بە «قوڕە بەرازەی گچکە» دەناسرا تا ئێستاش ئەو بنەماڵەیە هەر لە شوێنی کۆنی خۆیانن کوێخامحەممەد خۆشەویستی باوکم بوو زۆری ڕێز لێدەنا ئەویش تا بڵێی خاتری باوکمی دەویست چەند ساڵان دوای باوکم ژییا چەند جاری باسی باوکم بە زمانیدا هاتبێ لەکریژنی گریانی داوە من کە بیر دەکەمەوە لە بارێکدا بوو پۆشتە و پەرداغ خاوەن دیوەخانە و مەڕ و ماڵێکی زۆر، باشترین وڵاغ لە کەمەندی دابوو. ماینێکی کوێتی قاپڕەشی هەبوو هەتا دەست هەڵێنێ کەڵەگەت. لە رەسەنایەتی و ئاکاری پەسەندایەتی کەم وەها بووە ماینی وەها هەڵبکەوێ. دەهاتە نزیک زان فەرق نەدەکرا بە ئاوسبوونی باوەڕ ناکەم لەو دەوروبەرە وڵاغ هەبووبێ تۆزی شکاندبێ کوێخامحەممەد بەدوایی دەستی تەنک بوو، هەناسەی هەڵدەکێشا دەیگوت بەرەکەتی ماڵەکەم لەگەڵ ماینەکوێت ڕۆیی.

ساڵحاغا یەکجارەکی لە خرابە نیشتەجێ بوو. حەماغا کەم وەهابووە مڵک لە سەرخۆی تاپۆ بکا، بەڵام لەبەر وەزعی تایبەتی ئەو ڕۆژگارە خرابەی بە ناوی خۆیەوە تاپۆ کرد، بەڵام داهاتی بۆ ساڵحاغا بوو کە زاواشی بوو. دوای ساڵحاغا عەزیزاغا کە کوڕە گەورەی بوو خوشکی بچووکی کاکەزیادیشی مارە کرد و لە خرابەش بە براگەورە مایەوە لە تەسویە دێیەکە بەناوی ئەو خوشکەی کاکەزیاد بێنیزاع تۆمار کرا. لێرە بە موناسەبەی ناوی «تاپۆ» پێش دەستی دەکەم و خەبەرێکی دەسخاوێنی حەماغا دەگێڕمەوە:

سمایلاغای مەلائەحمەداغای سمایلاغا باسی دەکرد کە مەئموور تاپۆیەکی کەرکووکی لە زەمانی عوسمانلی بە حەماغای ڕاگەیاند ئەگەر «320» لیرەی بداتێ 32 دێی محاڵی شاڵەبەگیان و بناری کۆسرەت بە دیوی بیتوێندا

بەناویەوە تاپۆ دەکات حەماغا گوتبووی ئەمن هەر خدرانم هەیە لەو ناوە دەخلم بەسەر ملکی خەڵقەوە نییە هەر لەو بابەتە ڕوویدا کە مەحموودپاشای جاف جارێکیان سەر لە کۆیێ دەدا بە حەماغا دەڵێ ئەگەر ڕای لەسەر بێ ئەو دەتوانێ چەند جۆگە و بەراوێکی بیتوێن لەسەر هەر دووکیان تاپۆ بکرێ حەماغا ئەمەشی نەسەلماندبوو هەرچەند جۆگەکان ئەمیریش بوون.

هەرا بەو توندی و تیژییە بەردەوام بوو خەڵقی دەشتودەری وڵاتی کۆیێ لەبەر ڕەو و ڕاووڕووت و خەرمان سووتاندن خەریک بوون قەڵاچۆیان تێبکەوێ حکوومەتی قەزا و لیوا «سنجاغ»و ویلایەت لە کۆیە و کەرکووک و مووسڵ گوێی پێنەبزووت و خۆی نەخوراند و بەکەسی نەگوت پشتی چاوت برۆیە لێرەدا قسە لە باوکم دەگێڕمەوە کە بەوردی و بە درێژی باسی ئەو حاڵ وبارەی بە مەجلیس دەگوتەوە و وەکوو داستانی مێژوو یان ئەفسانە دڵی گوێگری بۆ خۆی دەدزیەوە باوکم دەیگوت:

کە هەرا درێژەی کێشاو ساڵە و ساڵ لە توندی و تیژی و خەسارەت و خوێنرێژی و ماڵ کاولی زیاد کرد و حکوومەت لە قەزا هیچ دەنگێکی نەکرد لەگەڵ حەماغادا ڕاوێژم کرد و بڕیارمان دا شکات بگەیەنینە کەرکووک، بەڵکوو موتەسەڕیف لەلای خۆیەوە شتێک بکات بەو نیازەی کە هەتا کێشە لەگەڵ حکوومەت بنەبڕ نەکەین واز نەهێنین نوێن و ئەسبابی ڕابواردنی شەو و ڕۆژمان بردە دایەرەی بەرید کە تەلخانەش هەر لەوێ بوو. مودیری تەلەفۆن و بێتەل پیاوێکی زۆر مەرد و موحتەرەم ناوی «نائل افندی» و خەڵقی ئەستەنبۆڵ بوو لەحەد بەدەر دۆستی باوکم بووە بەهۆی ئەدەبدۆستی خوێندەوارییەوە دڵیشی لەگەڵ میللەتەکە بوو لەو کارە نارەوایانەدا کە بە کەرەزەڕی لەگەڵیدا دەکرێ باوکم گوتی، نائیلەفەندی هێندەی ئێمە بە پەرۆشەوە بوو تا ئەوەی دەربڕی کە ئەگەر وەزیفەشی لەسەر دابنێ هەر چییەکی لێی داوا بکەین بۆمانی دەکات. ئەو موراجەعەیە 3- 4 ڕۆژی خایاند لەو ماوەیەدا حەماغا و باوکم هەر یەکە بە تاقمی خۆیەوە شەویش لە تەلخانە دەنووستن. لە سەرەتاوە بە هۆی بێتەل لەگەڵ موتەسەڕیفی

کەرکووک خەریکی موراجەعە بوون. دەقی بروسکەکان باوکم بە تورکی ڕێکی دەخست و مەسرەفەکەش لە کیسەی حەماغا دەردەچوو لەگەڵ کەرکووک خەریکبوونیان بێسوود بوو، ئەمجار یەخەی والی مووسڵیان گرت و ڕووداوی لەو دەمە بە پێش و موراجەعەی کەرکووکیان تێگەیاندبوو لە مووسڵیش هیچ پەیدا نەبوو. باوکم گوتی داوام کرد لە نائیل کە دەنگمان بگەیەنێتە وەزیری داخیلییە ئیتر بەرقیەی بەڕێ دەکرد بۆ وەزیر. هەر لە بیرمە باوکم گێڕایەوە کە لە وەڵامدا وەزیر پرسی ئایا هۆی ساردی نێوان غەفووری و شێخ بزێنی چییە؟ لە وەڵامدا پێم گوتەوە دنیا هەمووی ئاگری تێبەر بووە تۆ لە ساردایی دەپرسی؟ لەوە بەو لاوە کە ئومیدیان بە داخیلییەش نەمابوو باوکم دوای لێک حاڵیبوون لەگەڵ حەماغا داوا لە نائیل دەکا بەرقیەیان بۆ «مابین- بلاط»بنێرێ نائیلی جوانمەرد بێدوودڵی گوتبووی تێشدا بچم بۆتانی دەکەم ئیتر لە نووکەوە هەموو زوڵم و دەسدرێژی داگیرکەر و کەمتەرخەمی چەند ساڵەی قەزاو بێباکی و بێپەرۆشی کاربەدەستانی دیکەیان بە تەفسیلاتەوە بۆ سوڵتان کرد بە بەرقییە باوکم گوتی کە نائیل پێوەندی بە مابەینەوە کرد و وەڵامی وەرگرتەوە بە وشەی «مابین» ڕاچڵەکی و لەجێی خۆی ڕاست بۆوە و دانیشتەوە لەوەشدا حەقی بووە، چونکە مەودای نێوان مەئمووریکی بەرق و سوڵتانی عوسمانلی سنوور بەدەرە ئافەرین بۆ کوڕ کە جورئەتی کردووە دەرگەی لێبدات.

کە دەنگ گەییشتە سوڵتان باری مەسەلەکە گۆڕا لە پێشەوە دڵی جەماعەت دەداتەوە کە چاوەنۆڕی کردەوە بێ.

باوکم گوتی هەر ئەوەندە بوو خەڵق زانی کە والییە و نەقڵ دەبێت و موتەسەریفە عەزل دەکرێت و پیاوی عەسکەرییە چی بەسەر دێت. پەرتان پەرتانێک بەو مەئمووره زلانە دەکرێت عالەم واقی ووڕ دەمێنێ. بەفەرمانی سوڵتان هێزێکی زۆر بێئامانی سپای دەوڵەت بە فەرماندەی تازەوە چووە سەر شێخ بزێنییان و هەموو سەرۆکەکانی بە پیاوماقووڵ و دەست ڕۆییشتووەوە دەگیرێن ڕاپێچەک دەدرێن بۆ کۆیێ. سەیر لەوەدا بووە گەورەکانیان بە

کەلەپچەوە خۆیان بە مێوانی حەماغا لە قەڵەم دابوو تکاشیان لێکردبوو کە لای دەوڵەت بۆیان بپاڕێتەوە. باوکم گوتی حەماغا بە ڕاستی خەریک بوو ڕجایان بۆ بکا، هەتا توانیم پەشیمانی بکەمەوە ماندووی کردم. ئەوەشی گوت کە بۆ خاتری گەورەکانیان پتر ماندوو بن و باشتر بە خۆیاندا بشکێنەوە ئەو زابتەی کە بەرپرسی گەیاندنیان بوو بۆ هەولێر ترسم خستە بەر لەوەی بەڕێی عادەتی بۆ هەولێریان ببات نەکا دۆست و کەسیان ڕێ بە حەرەسەکانیان بگرن و دەربازیان بکەن واچاکە بەڕێی شەقڵاوەدا بۆ هەولێریان ببات. زابتەکە قسەکەی چووبوە دڵ و بەو شاخ و هەڵەت و پەڵەتەی نێوان کۆیە و شەقڵاوە و هەولێریدا بردن.

نازانم ماوەی حەبسبوونی سەرۆکەکان چەند بوو، بەڵام بەینێک لە بەندیخانەدا مانەوە تۆڵەی زەرەر و زیانیش بایی مومکین بوون لێیان وەرگیرایەوە. لەو تۆڵەیە 40 لیرە بە باوکم دەگات. بە مامی گوتبوو دەبێ لە شتێکی خەرج بکەین بەیادگار بمێنێ. دوو هۆدە و هەیوانێکیان بەو پارەیە لە گەچ و بەرد دروست کردبوو تا ئێستاش لەو بەشە خانووەی بەر مامم کەوت ئەو یادگارە ماوە.

وەها مەشوورە دەڵێن جارێک لە جاران حەماغا بە هاواری تاڵان کراوانەوە دەڕوات ئاوڕ ناداتەوە بزانێ کێ بە دواوەیەتی. ماوەیەکی زۆر ڕاوی ئەو دوژمنانە دەنێ کاتێک کە ئاوڕ دەداتەوە دەبینێ تەنها قادراغای برازای خۆی لە دواوەیەتی خەڵقەکەی دیکە هەمووی دادەماڵێ. لەوەوە قادراغای کەوتبووە بەر دڵی و وەهای پێش یەخست بوو بە بەرچاوترینی ئاغاکانی ئەو سەردەمە. قۆناغی قادراغا لە خدران بوو پەرداغتر بوو لە قۆناغی حەماغا لە قەبیشی لەناو خەڵق بوو بە قادر پاشا، بووش بە زاوای حەماغا، بەڵام هەر وەک سمایلاغای باوکی لە 1284ک. بە جحێڵی کوژرا خۆیشی بەر لە حەماغا بە جحێڵی مرد. یەکێک لە نیشانەکانی بەرفرەوانی سینەی حەماغا ئەوە بوو کە زاوای ژنی بەسەر کچەکەی حەماغا هێناوە کچ و هەوێکەی بەیەکەوە لە ماڵی حەماغا ژیاون و هەر یەکە ژووری سەربەخۆی هەبووە و بێجودایی

کردن لە نێوانیاندا خزمەتیان کراوە و ڕێزیان لێنراوە. ئەم ڕاستییەم لە باسی قادراغاوە بە بیردا هاتەوە کە ئەویش هەوێی بەسەر کیژی حەماغا هێناوە و لە کۆیێ لە ماڵی ئەو هەر دوویان پێکەوە ژیاوون. هەوێکە خوشکی دوایین خێزانی حەماغا بوو کە کیژی حاجی ئەسعەداغای حەوێزی بوون. دوای قادراغا ئەم هەوێیە شووی کردەوە بە شوو برای کە مەلائەحمەداغای سمیلاغا بوو، بەڵام زۆر بە سەیری هەتا ژیبا هەر پێی دەگوترا فاتمەخانی قادراغا. دەڵێن سەیرە لە کۆیێ..

حەزم دەکرد بمزانیبایە لە شەڕەکانی ئەو دەورەیە کێ و کێ سیلاحشوڕی و ئازایی نواندووە. وەک کە خۆم دەزانم کوێخامحەممەد ئازا بووە، بەڵام ڕاستییەکەی چ ناوێکم بە بیردا نایەت مەسەلەکەش ئەوە ناهێنێ دەستی بۆ لە نووسین هەڵبگرم تا لە باخەبەرانی کۆیێ دەپرسم و وەڵامیان لێ وەردەگرمەوە، چونکە لە ڕواڵەتدا چ کەم و کەسری بەسەر باسی حەماغادا نایەت ئەگەر نەزاندرێ فڵانە کەس لە فیسار شوێندا وەهاو وەهای کرد، ئەوەی گرنگە لێرەدا ڕووداوەکان خۆیانن کە پێوەندییان بە حەماغاوە هەیە. بەهەمەحاڵ دوای تەنبێ خواردوبوونی شێخ بزێنییان و کشانەوەیان لە وڵاتی کۆیێ جاری دیکە بە کەڵەزەڕی و ئاشکرایی دەسدرێژییان نەکرد یان نەیانوێرا بیکەن. بەڵام دیسانەوە هەتا چەند ساڵێکیش دوای بڕانەوەی هەراکە کۆیە و شێخ بزێنی لەیەکدی بەتەقیە بوون. بە نموونە مامم دەیگێڕایەوە کە لە دەمی شەڕی یەکەمی جیهانیدا لەگەڵ فەقێکانی هاوتەمەن و هاوخوێندنی خۆی چوون بۆ ئیمتحان لە کەرکووک بایی پاراستنی خۆی چەک و پیاوی لەگەڵدا بووە و ئەو شەوەی لە قەرەناو «یان دێیەکی دیکە بووە» ڕایدەبوێرن بە ئێشک نووستوون. وەهاش ڕێک دەکەوێ ئاغایەکی گەورەیان بە سیلاح و پیاوەوە دێتە ئەو چایخانەی کە مامم و فەقێکان کردبوویان بە قۆناغی شەوانەیان ئاغاکە «وابزانم تۆفیقاغا بووە» دەمامکی کردووە و نایەوێ باش ئاشکرا بێ یەکێک لە فەقێکان لێی دەپرسێ بۆ وەها دەمامکی کردووە ئایا ددانی دەئێشێ یان لە خەڵقەکە و لە خۆی

گوماناوییه خولاسه به پرسیار سەری دەکاتە سەرێ هەتا مامم لێی بەدەنگ دێت و بە نوکتە دەڵێ وازی لێبێنە کردت بە کتکی سەرچنار. ئەو ئاغایە خۆی دانیشتووی گوندێ بووە کە ناوی سەرچنارە مامم گوتی دەمزانی کام ئاغایە کە نوکتەکەشم تێگرت تفەنگ لە گوێمدا بوو، بەڵام ئاغا کە خۆی نەگرت و کەوتە پێکەنین. خولاسە هیچ ئەسەری دوژمنایەتی نواندن و تۆڵە ستاندن لەو ئاغایە بەدەر نادات سبەینێش کە فەقێکان بەڕێ دەکەون کەسیان نەهاتە سەر ڕێگا و سەفەریان لە چوون و هاتندا سەلامەت بوو.

شایانی باسکردنە بڵێم بە درێژایی ئەو هەرایە بڵباسەکان یاریدەی حەماغایان داوە چ بە پیاو چ بە ماڵ. ڕەنگە هەراکە بەر ئەو ڕۆژگارە کەوتبێ کە حەمەداغای باوکی سواراغا سەرۆک بووە، چونکە جارێ سواراغا لە تەمەنێکی شلکدا بووە. کاکەزیاد خۆی ئەم لایەنەی یاریدەی بڵباسەکانی بۆ گێڕامەوە ئەویش لە خەڵقی دیکەی بیستووە چ خزم چ بێگانە، چونکە وەلادەتی لە 1914 بووە کە پاش هەراکە دەگرێتەوە. یاریدەی بڵباسەکان بۆ حەمەداغا تەنها تەئویلی دۆستایەتی و وەفاکاری هەڵدەگرێ نەک ئەوەی کە ئاگربڕییان لە خۆیان کردووە گۆیا لە دوواڕۆژدا هەرا یەخەی خۆشیان دەگرێ چونکە لە خەیاڵیشدا شێخ بزێنی ناگەنە هەرێمی بڵباسان. خۆ ئەگەر لایەنی بەرژەوەندی ڕووتیان ڕەچاو بکردایە دەبوو بڵباس دۆستی شێخ بزێنییان بن چونکە غەفووریەکان لە بیتوێن مومکینە تەنگەتاوکەری بڵباسان بن.
واپێدەچێ قەدری حەماغا لای بڵباسەکان پایەیەکی بڵندی هەبووبێ ئەوەی ڕاستیش بێ من خۆم شایەدی قسەیەکی سواراغام. بەر لە مردنی بە دوو سێ ساڵ لە موناسەبەدا مامم و من مێوانی نیوە ڕۆژەی بووین لە سەرخمە قسە بە هەموو لایەکدا شریتەی هاویشت و کێشایەوە سەر ناکۆکی سواراغا و غەفوورییەکانی نیشتەجێی هەرێمی بیتوێن و دیوی شاڵەبەگیان کە پتر لەسەر حەوێزاغا حیساب دەکران سواراغا بە سوێندەوە گوتی ئەگەر کوڕی حەماغا بە تێلایان لێم ڕاکێشێ و لە ڕووی هەڵگەڕێمەوە خۆم بە پیاو نازانم

ئەمما لە چ ئاغای دیکەشم گەورەیی پێقەبووڵ ناکرێ…ئەمەی گوت کە لەو دەمەدا هاتوچۆی لەگەڵ کاکەزیادیش نەبوو.

ئێستا قسەمان دەگاتە کوڕە تاقانەکەی حەماغاو چۆنیەتی هاتنە دنیای. حەماغا بەر لەو تاقانەیە منداڵی نێرینەی نەبووە. هەرچی بوویەتی کچ بووە وا دیارە مارەکردنی پێنج ژن دەخلێکی هەبێ وەلای گەڕان بەدوا ئەولادی نێرینەدا گەلێک کەسی دیکەی ئەم جیهانەش بە نیازی «کوڕ» ژن گۆڕییان کردووە یان چەند ژنێکیان لە نیکاحدا بووە هەرچی حەماغا بوو هیچیانی تەڵاق نەداوە و بێحورمەتی لەگەڵدا نەکردوون.

لە کتێبەکەی «دووساڵ لە کوردستان» کابتن های خواوڕاستان باسێکی ئەم لایەنە دەکات کە چۆن مەلایەک خەونی دیتووە… و… های لە شێوەی باوەڕنەکردندا باسەکە دەگێڕێتەوە، بەڵام هەر نەبێ نووسینەکەی کۆنترین سەرچاوەیە بۆ ڕووداوێکی گرنگ لە ژیانی حەماغادا مەوداش لە نێوان ساڵی 1914 کە کاکەزیادی تێدا هاتە دنیا و ساڵی 1919 کە های قسەکەی بیستووە هەمووی پێنج ساڵە بایی ئەوە ناکا دەنگوباسی تێدا کۆن ببێ و ئەفسانەی تێبکەوێ. ئەو مەلایە بە ڕاستی خەونی دیتووە «یان هەر نەبێ گوتوەتی خەونم دیتووە» بەدوا خەونەکەشدا حەماغا کوڕی بووە ئیتر من و کابتن های بە خەونی مەلا باوەڕ دەکەین یان نا دەخلی بەسەر ڕووداوەوە نییە.

من مەسەلەی ئەو خەونەم لە باوک و دایکی خۆم بیستووە. لای خەڵقی دیکەش وەک لای کابتن های خەونەکە مەشوور بوو ئیتر هەر تەئویلێکی لێدەدرێتەوە با بدرێتەوە لێرەدا حاڵ وباری لە دایکبوونی تاقانە کوڕی حەماغا باس دەکەین.

لە کۆیێ دیندارێکی بێفێڵی بێمانەند هەبووە ناوی مەلا ئەحمەد بووە لەبەر چاوی زەعیفی پێی گوتراوە مامۆستا کۆرە. ئەم دیندارە یەکێک بوو لە دوو دینداران کە شۆرەتی ڕاستی و خاوێنی و ئیمانیان بەلای هەموو کۆیەوە لە

گومان بەدەر بووە. دیندارەکەی دیکە مامۆستا مەلا ژنەعەنبەر بووە کە لە دەرەوەی شارەوە بە یەکێکی «خادم السجادە»ی کۆیێ دراوە. مەلا ژنەعەنبەر زووتر مرد. لە گەورەیی ئەو ئافرەتە هێندە دەڵێم کە جەنازەکەی بەسەر شانی پیاوماقووڵانی کۆیەوە بردرا بۆ گۆڕستان و حاجی مەلا عەبدوڵڵا کە یەکێک بوو لەوان گوتبووی یەکێک مردووە هەمووان دەهێنێ...
مەلائەحمەد «مامۆستا کۆرە» لە مریدانی بریفکان بووە و بەینێک لەوێ ئاشەوانی کردووە کاکەحەمەدی شێخ لە بەعزێ نامەی کە بۆ حاجی مەلاعەبدوڵڵای ناردووە دەنووسێ سەلام لە ئاشەوان دەکەم مەبەستی مەلائەحمەدە. باوکم بارەها و جارەها مەجلیس شەوانەی بە باسی مامۆستا کۆرە ڕادەبوارد و عیشقێکی ئەو کوێرەی لە دڵدا بوو هەرگیز کز نەبۆوە. لە نێوان ئەو باسانەی کە مامۆستا کۆرەی دەگێڕایەوە ئەوە بوو کە ڕۆژێکیان پرسیار لە باوکم دەکا ئایا لەماڵەوە هیچی ئەوتۆی بیستووە وەها ڕابگەیەنێ خێزانێکی حەماغا حەملی هەبێ. دوای پرسین لە دایکم بە مامۆستا کۆرە دەڵێتەوە کە ئایشەخانی کیژی حاجی ئەسعەداغا حامیلەیە. مامۆستا دەڵێ بە حەماغا ڕابگەیەنن خەونم دیتووە. کوڕێکی دەبێ ناوی لێ بنێ حەمەزیاد ناشبێ لە ماڵی خۆی بەخێوی بکا، قسەشم زۆر پێیە بەڵام ڕێم نییە دەریان برم.

خوێنەر خۆی چۆنی پێخۆشە با وەها لەو قسانە ڕامێنێ، بەڵام من بایی تۆسکاڵێک گومانم لە خەون پێشبینییەکەی مامۆستا کۆرە نییە، چونکە هەم خۆی ڕاستگۆ و ڕاسترۆ بووە هەم قسەکەشی بە بێ پێچوپەناو چەرخ و دۆلاب بووە چ مەبەستی دنیاییشی لە پەنا خەونی هەڵبەستراودا نەشاردۆتەوە. مرۆی ڕاستگۆ و ڕاسترۆش خەبەرەکەیان بە ئێمە گەیاندووە کە ئەوانیش چ مەبەستی دنیاییان لەو حیکایەتە وەرنەپێچاوە. لەمەش بگەڕێین ئەگەر لەگەڵ خۆماندا ڕاست بکەین هەموومان کەم و زۆر دیاردەی خەونی ڕاست و هەستی پێش ڕووداونمان لە خۆماندا بە دی کردووە ئیتر بۆچی گومان لە کابرایەک بکەین کە هەموو کۆیێ لە سەردەمی خۆیدا

شایەدی چاکە و ڕاستی و خواناسی و ئیمانداری ئەو بوون. دووای مردنی بە دەیان ساڵ پیاوێکی وەکوو باوکم بە گەرمایی عیشقەوە باس و خواسی دەگێڕایەوە. بە زاری خۆی دەیگوت. ئەو کتوکوێرە ئەگەر ئاوی چاو و لووتیشی کەوتبایە ناو خۆراکی بەردەمم بێزم لێی نەدەکرد. دەیگوت مامۆستا کوێرە «نحو»ی عەرەبی نەدەزانی، بەڵام چەندێکی بە ئانقەست عیبارەتم بە هەڵە بۆ خوێندبێتەوە گوتوەتی تێی ناگەم هەتا دەچوومە سەر ڕاستییەکەی ئنجا دەیگوت ئابابەلێ با مەعناکەت پێبڵێم. لێی دەگێڕایەوە کە ڕۆژانەی غەیری ڕەمەزان بەڕۆژوو دەبوو زۆر جاران لێی دەگەڕام هەتا دەهاتە نزیکی بانگدان، خواردنێکم بۆ ڕادەگرت گورج لێی وەردەگرتم و گوێی نەدەدایە ئەرکی درێژایی شەو و ڕۆژانی و پاروەکەی دەخوارد و ڕۆژوەکەی لە کیس خۆی دەدا و دەیگوت نەفسەکەم پێی ناخۆشە بیشکێنم بە ڕۆژوو شکاندنەکەم نەفسەکەم دەشکێنمەوە.

باسی مامۆستا کۆرە لێرەدا جێی نابێتەوە، چونکە لە زۆر ڕووەوە دەبێ لێوەی بدوێین و خەریکی لێتۆژینەوەی بین. چی پێوەندی بە بابەتی نووسینمانەوە بێ ئەوە بوو بە کورتی باسی کرا، حەماغاش هەموو ڕاسپاردەکانی مامۆستای بەجێهێناوە ناوی کوڕەکەی نا حەمەزیاد و لەلای شوانکارە لە دەرەوەی شار و ماڵی خۆی بەخێو کرا. دەگێڕنەوە، دووای چەند ساڵێک لە وەلادەتی کاکەزیاد حەماغا داوەتێکی تێکڕای خەڵق دەکا لە دێی هەرمۆتە ئەو ڕۆژە کاکەزیاد بە بەرگی شوانکارەییەوە دەهێنن و بە بەرچاوی باوکیدا تێیدەپەڕێنن. وەک دەبینین سکاڵاکەی زڕداکی حەماغا بەر لە مردنی بەو خەنجەرەی حەماغا لێی دا بەتەواوی هاتەجێ و حەماغا کڵاوسووری لە دواوە نەرۆیی.

ناوی دێی هەرمۆتە لێرەدا داوامان لێدەکا لە کولانەی باسی حەماغاوە ڕووناکییەکی بخەینە سەر. ئەم دێیە وەک عەنکاوەی هەولێر هی دییانەکانە «دییان - مەسیحی، لە سلێمانی دەڵێن گاوور» هەر چەند لە بارستدا یەک بەدەی ئەویش نابێ. لە مێژووی کۆنی بەر لە 1300 ساڵ بەپێی ئەو کتێبەی کە ناوی بە «کتێبی مەلا صمدی» مەرگەیی ڕۆییشتووە

هەرمۆتە لەو ڕۆژگارەدا شارێکی وەکوو کۆیەی ئەو دەم بگرە گەورەتریش بووە مسڵمانەکان دووای شکستێکی گەورە لە شەڕی دووەمدا دەیگرن ئەوساش شاری دیبانەکان و ناوی گەورەکەی «میطا»بووە هەرمۆتەش لەو دەسنووسەی کە من دیتم بە «ارموطا» ناوی دێت. ئێستاکە و لەسەردەمی حەماغادا دێیەکی بە ئاو و بەراو و خاوەن میوە و شیناوورد و دەغڵ و دان بوو باشترین زەیتوونی لێهەڵدەکەوێ. بەشێکی بەرچاوی براگەورەکانی پێوەندییان بە غەفووری و بە شەخسی حەماغاوە هەبووە تەنانەت کۆرە دییان هەتا مرد لە ماڵی حەماغا و کاکەزیاد بە مەحرەم دەناسرا. سێوەی گۆرانی بێژی مەشوور لە هەموو پێویستێکدا گۆرانی لە دیوەخانی کاکەزیاد و مەلاحەوێزاغادا دەگوت. لە دەمی پیری سێوەدا کاکەزیاد هێنایە بەغدا و ئەو چەند گۆرانییەی لە ئیزاعە پێ پڕکردەوە. سێوە خۆی خەڵقی هەرمۆتە بوو واش بزانم ناوەکەی لە سلێوەوە بۆتە سێوە. بە ئیزنی خوێنەر و بە ڕەزامەندی یەکێک لە گۆرانییەکانی باس دەکەم ئەویش گۆرانی «سەحەر».

لە پیرەژنەکانی کە ئاشناییان لە گەڵ ماڵی ئێمەدا هەبوو بیستوومانە کچە جوولەکەیەکی کۆیێ ناوی «سەحەر» و زۆریش جوان بووە. کوڕێکی حاجی مەلائەسعەدی جەلیزادەش کە لەگەڵ مەلائەحمەددا بە زگێک «جمرانە» دەبن و ناوی «محمدبهاء الدین»بووە گەنجێکی زۆر لاوچاک و دەنگخۆش بووە. بە عادەت ئافرەتان دەچوونە جلک شووشتن بۆ ڕووبار و ڕێگەیان بە بەر مزگەوتی حاجی مەلائەسعەد دابووە محەممەد بەهاء شەیدای ئەو سەحەرە بووە لەو دەمانەدا کە سەحەر بۆ ئیشی خۆی هاتۆتە سەر ڕووبار کاکە بەها دەوری دەرسەکانی وەها بە گەرمی کردۆتەوە و دەنگی لێهەڵبڕیوە خەڵقی گەڕەک هاتوون بۆ گوێ لێگرتنی. دەنگدانەوەیەکی دەرس و دەوری فەقێیان لەناو گۆرانییەکەدا هەیە هی ئەو عیشقەیە. کاکە بەها بە گەنجی جووانەمەرگ بووە. ئەم گۆرانییە یادگاری عیشقێکی بێئاکامە. بەلای کەمەوە 135 ساڵێک بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕیوە، چونکە بەها لە دەوری

1253ک. هاتۆتە دنیا لە 1270 فەقێیەتی کردووە و ئەو دەور و دەرسەی بۆتە بنیچەی گۆرانیەکە.

کەمایەتی ئایینی دیان و جووی کۆیێ لە کۆنی کۆنەوە بە تەبایی لەگەڵ مسڵمانی کۆیە و ئەو ناوە هاتوونەتە خوارێ. نەبیستراوە بە جۆرێکی ئەوتۆ ناوی گەلەکۆیی پێوە بێ لەلایەن مسڵمانانەوە دەسدرێژییان لێکرابێ. ڕەنگە بەهۆی تەقیەی جوداوازی دینەوە بێگاریان کەمتر پێکرابێ لە مسڵمانان هەروەک لە عەسکەری و خزمەتی ئاڵادا ئەرکەکە کەوتۆتە سەر شانی مسڵمانان. لە دەمی ئاژاوەدا کە بە عادەت تێکەڵ پێکەڵی دەبیت و سنوور دەبەزێنن ئەو کەمایەتییە ئایینییانە لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە پارێزراون. لە کۆیێ دەسەڵاتی دنیایی بە زۆری لە دەست غەفووری و حەوێزییاندا بوو لە سەردەمی حەماغادا ئەو دەسەڵاتە پتر بۆ ئەو دەچۆوە دوای ئەو کە جەمیلاغا بوو بە قائیممەقام پشکی حەوێزییان لە دەست ڕۆییشتن زیادی کرد هەروەک لە دوای حاجی بەکرئاغا غەفووری برەویان ستاند. جگە لەم دوو بنەماڵەیە مرۆی دیکەش هەبوون بتوانن چ بە خاترانە چ بە مەرکەزی تایبەتی خۆیان بێت پەنای ئەو لەخۆ ترساوانە بدەن، بەڵام لێرەدا قسە لە حەماغایە کە پیاوی دنیایی و ئاغا بوو، بۆیە تەنها لە تای تەرازوودا هەر ناوی حەوێزییانم هێنا. خولاسە دیان و جوو بە ئاشکرا دەسدرێژییان لێنەکراوە مەگەر چۆناوچۆنی بووبێ. پیاوماقووڵ و قەشە و ماڵەکانیشیان لە هاتوباتی ڕەسمییات و جەژنەدا بارتەقای ماقووڵەکانی مسڵمانان بەخێر دەهێندران و ڕێزیان لێدەندرا. من بە چاوی خۆم دەمدیت لە دیوەخانەی باوکم هەمیشە قەشە و مالم لە باری هەرە سەرەوە جێگەیان ڕەچاو دەکرا. ئنجا هیچ سەیر و سەمەرە لەوەدا نییە کە جوولەکە و دیان حەسانەوەیەکیان لە سێبەری حەماغادا دیتبێ، چونکە حەماغا دوژمنی خۆیشی پەنا داوە کە ڕووی لێنابێ یا خود کۆرە دیان کە مەحرەم و تا ڕادەیەک مەسرەفچی ماڵی حەماغا بووبێ.

شەڕی یەکەمی جیهانی لە 1914 ز. دەستی پێکرد و حکوومەتی عوسمانی بەپێی مەیلی قسە ڕۆییشتووەکان حیزبی «اتحاد وترقی» دووای کەمێک لە هەڵگیرسانی بە دۆستایەتی ئەڵمانەکان خۆیان و دانیشتووانی قەڵمرەوی تورکانیان تێوەگلاند. عێراقی خۆمان لە جەنگی دووەم هەرچەند لەگەڵ بریتانیادا هاوپەیمان بوو دووچاری ئەو نەگبەتیە نەهات کە لە شەڕی یەکەم بە شێوەی بەردەست لەگەڵ تورکەکان دووچار بوو. دەسدرێژی کردن و ڕاووڕووت و بێقانوونیش کە لە شەڕی یەکەمدا حکوومەت لەگەڵ میللەتی دەکرد دە ئەوەندە لە ئەرک و ئازاری خەڵقی زیاد دەکرد. لە ساڵانی ئەو شەڕەدا کەس نەما بەقەدەر حاڵ دووچاری سەغڵەتی و نارەحەتی و ناگزووری نەیەت. حەماغاش وەک خەڵقەکە بەشداری ئەو حاڵ وبارە بووە. بەڵێ ڕاستە پیاوی دەوڵەمەند تاقەتی خۆڕاگرتن و بەرگری پترە لە پیاوی لات و هەژار بەڵام لێرەدا چەند خاڵێک لە شێوەی تێبینی سەرنج ڕادەکێشن:

1- چ کەسێک لەسەر لەبەری کوردستان بەرپرس نەبوو لەو بەڵایەی کە تەلعەت و ئەنوەر و جەماڵ بەسەر خەڵقیاندا هێنا ئنجا ئەگەر یەکێک حاڵ و وەزعێکی خۆڕاگرتنی هەبێ بە گوناهبار ناژمێرێ لە ئاست ئەو هەژارانەی لە فەلاکەتی شەڕدا ڕزانەوە. بەڵایەکی ناگەهانە و بەمل خەلقوڵڵادا هاتووە و هەمووی تێیدا بریندار و خەفەتبار و تازیەدارە. کوردستانی عێراق بە هەموو مسیبەتێکەوە کە دووچاری بوو یەکجار بەختیارتر بوو لە کوردستانی ئێران کە ڕەوی لەشکری قەیسەری ڕووس هەموو ئەو شوێنانەی تێدا کاوول کرد کەبەر لێشاوەکەی کەوت. ڕووت و برسی و پەنابەرەکانی کوردستان و ئازەربایجانی ئێران کە ڕوویان بۆ دیوی عێراق هێنا یەکێک بوو لە هۆی قات و قڕی ساڵی 1917 کە دانیشتووانی کوردستانی عێراقی وەک گەڵای پاییز هەڵوەراند.

2- سەرلەبەری خەڵق بە گەورە و گچکەوە هەڵگری ئەرکی شەڕ بوون تەنانەت خاوەن دەسەڵاتەکان زۆریان بە مەسرەفی خۆیان دەچوونە مەیدانی شەڕ و لە پێناو عەقیدە دەبوونە غەزاچی یەکێکی وەکوو حاجی سەیدگوڵی

شێخ قادری سندوڵانی پژدەر «مامی دایکم» بە دڵ بەرەو پیری شەهید بوونەوە چوو بۆ کوردستانی ئێران و لە 1916دا بە گەنجی کوژرا. چەندین پیاوماقووڵ و دەوڵەمەندی دیکەی وەک ئەو کوژران و تەرمیشیان نەدۆزرایەوە مەزنە پیاوی وەکوو شێخ مەحموودی حەفید و سەیدە حمەدی خانەقا بەشداری شەڕەکانی باشووری عێراق بوون تەنانەت سەیدە حمەد لە شەڕی «وابزانم»شعیبە بریندار بوو بە جۆرێک دوای بڕانەوەی شەڕ و نەفی کردنی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە برینی چاک نەبووبۆوە. خولاسە نە بە فەقیری و دەوڵەمەندی خەتای فلان و فیساری دەستنیشان کراو بوو نە شەڕیش بە ئارەزووی کوردی قوڕبەسەر بوو. حەماغای کۆیێ بەپێی پایەی دەسەڵاتی خۆی و سەخاوەت و مەردایەتیەکی پێوەی مەشوور بوو هەم لە حکوومەتەوە پتر لە خەڵقی دیکە دەبووە جێی تەکلیف هەم لەلایەن میللەتەوە بەنواو پەنای بێنەوایان سەیر دەکرا. لە باوکم بیست گێڕایەوە جارێکیان لە دەمی حەربدا قائیممەقام براگەورەکانی بانگ کردە لای خۆی و دەیەویست پیتاک لەو خەڵقە وەرگرێ وادییارە ویستبووی سامی خۆی بەسەریاندا ڕابشکێنێ لە وتووێژدا بە توندی لە حەماغای ڕاخوڕی بوو، باوکم گوتی حەماغا لە جێگەی خۆیەوە نەختێک سینگی هەڵکێشا و دەستی ڕاستەی گەیاندە دەسکی خەنجەرەکەی و ڕووی لە قائیممەقام کردو پێی گوت، جەزا دەستێنی یان پیتاک وەردەگری کەیفی خۆتە ئەمما قسەی زیاد مەکە دەنا بە قەبری مەحمووداغا بەو تەختەتەوە دەدرووم. ئیتر قائیممەقام فش بۆوە.

3- کە دەسەڵات نەبوو لە ڕەتکردنەوی بەڵای گەورەی وەکوو شەڕی چوار ساڵەی 1914-1918 دەمێنێتەوە کردار و ڕەفتار مرۆی پێتاقی بکرێتەوە. بایی ئەوەی لە کردەوەدا مرۆ بە ئینساف و مرۆوەت و خزمەت و پەنادان و قوتارکردن بووبێ بە مەرد و پیاو و شەرەفدار دەژمێردرێ.

وڵاتی کۆیە لە چاو وڵاتی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی خاکێکی زۆر بێبرشت و بێپیتی هەیە بەشێکی زۆری بریتییە لە بەرد و شاخ و زورگ و سووک کە گیاش ناهێنێ بەستی شەڵغەش کە لە دیگەڵەوە دەست پێدەکات

و پێبەپێ بەرەو زێی گچکە پان دەبێتەوە و بەستی ڕەق و هەڵەتی وشک و زیخماڵ بەدوا یەکدا پێکەوە دەنێ وڵاتەکەی کەرت کردووە و تەنگی بە حاڵ و باری فەلاحەت و مەڕداری و شینایی هەڵچنیوە. لە کۆنینانمان بیستووە ئەحمەد پاشای بابان خەفەتی لە شەڵغە خواردووە و گوتوەتی ئای شەڵغە چەندەت دنیا لەکیس داووم. لە مەقالێکی د. مەحموود ئەمین کە لە ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی وەرگێڕاوە لە ژمارەیەکی گۆڤاری سۆمەردا بڵاوی کردۆتەوە قسە لە خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە و دەڵێ سەرجۆنی ئاشووری لە حەملەیەکی «وابزانم هەشتەمە» کە سپاکەی بۆ بەری کەرکووک پەڕاندەوە و لەوێوە ڕووەو ڕۆژهەڵات بۆ کوردستانی ئێران چوو لە ترسی هەڵەت و پەڵەتی شەڵغە بووە کە ڕێ نادا عەرەبانەی تێرا بڕاو «من لە بۆچوونەکانی خاوەن گوتار و لە هەندێ شوێنی وەرگێڕ ڕازی نیم لێرەدا مەبەستم بێفەڕی و بێکەڵکی شەڵغەیە». خولاسە وڵاتی کۆیێ لە ئەرز و ئاو تا بڵێی هەژارە تەنانەت بە نوکتەوە گوتوومە چاک بوو وڵاتەکەمان ئاوی کەمە دەنا لەبەر بێئەرزی هەمووی خەسار دەبوو. گوزەرانی کۆیێ لە بنەڕەتەوە بەند بووە بە تیجارەتی ترانزیت و مامڵەتی لەگەڵ دراوسێکانی کە کێشاوەتیەوە بۆ پەیدابوونی وورده سەنعەتی پێویست بۆ ژیانی ئەو سەردەمانە وەکوو چنین و چەخماخسازی و زیندروەتی و ئاش نانەوە و دەباغچییەتی... و... و... کە کۆیە و هەرێمێکی پان و بەرین بگرە لەبەری کەرکووکەوە هەتا سەردەشت و دیوی ئێرانی بەو ئاتاجانە تەیار کردووە و تیجارەت و خوێندن و مزگەوت و دیوەخانە و خانەقا و تەکیەی بەدوا خۆیدا هێناوە. کە شەڕ دەستی پێکرد ئەو بازاڕە لە خۆوە کز بۆوە چونکە ڕێی ترانزیت وشکایی هات، بە درێژکێشانەوەی شەڕ و هاتنی لافاوی پەنابەران لە ئێرانەوەش هەم بەرهەمی کشتوکاڵ کەم بۆوە لەبەر نەمانی جووتیار و سەپان هەم قاتوقڕی و گرانیش بەسەر داهات لەبەر ئەو لافاوە برسییە و لەبەر زوڵم و زۆر و ڕووتاندنەوەی بێئینسافانەی فەرمانبەرانی عوسمانلی. کۆیەی پاش گرانی وەزعی گەییشتە پلەیەکی وەها نزم کە هەندێ جار نوێژی جومعەی لێنەدەکرا چونکە، 40

پیاو لە دانیشتووانی شار پەیدانەبوون ژمارەی پێویستی ئەو نوێژە بەپێی داخوازی شەرع پێکبهێنن.

حەماغا و غەیری حەماغاش لەو بارە تەنگەتاو و نالەبارەدا ئاکار و هیممەت و پیاوەتییان تاقی کراوەتەوە و بە گەزوگرێی کوردانەش پێوراون نەک بە پەرگار و کۆنیای نەزەرییان کە تەمایان نییە چەندوچۆنی ڕفتار و کرداری تاکان بەهەند هەڵگرێ ئێمەش لە باسی تاکدا چ ڕێمان لەپێشدا نییە ئەوە نەبێ کە گرتوومانەتە بەر، خۆ ناتوانین لە تێکڕای جیهانی ئادەمیزادەوە عەیارەیەکی بەرین بەقەدەر ڕووی زەمین ساز دەین و وەکوو سەرقاپ بەسەر هەموو خەڵقی دابهێنین تا بزانین کێ و کێ تێیدا بە پیاوچاک دەردەچن جا ئەگەر بگوترێ چاکە و خراپەی فلان و فلان شتێک نییە کار بکاتە سەر چارەنووسی ئادەمیزاد بەوەشدا چاکەی مەردان بسڕینەوە یان بێبایەخ بکرێن لە دوو نوختەوە بەلای کەمەوە بەرپەرچی ئەو تێوەڕیخە دەدرێتەوە:

نوختەی یەکەم ئەوەیە کە چاکەی تاک ئەگەر ژمارەیان زۆر بوو لەوانەیە چارەنووس بگۆڕێ، خۆ چارەنووس شتێکی مەوهووم و تریفەیی نییە بە ئایەتەلکورسی نەزەرییان نەبێ دەسگیر نەکرێ. تۆ بێنە بە خەیاڵ لە دووسەد ساڵ بە پێشەوە ژمارەی چاکان بکە بە دە ئەوەندەی هی بەدان بێگومان کۆمەڵگەیەکی وەها بەختیار پێکدەهێنیت بە شۆڕش پێک نایەت. سویسرا شۆڕشی نەکردوە و لەوپەڕی کامەرانیدایە جێی وەهاش هەیە شۆڕش بەدوا شۆڕشی تێدا هەڵستاوە و زۆریش تەنگەتاو و ناڕاحەتە. بەهەمەحاڵ چاکە ئەگەر چارەنووسی گەلانیش نەگۆڕێ چارەنووسی ئەو کەسە دەگۆڕێ کە چاکەکەی لەگەڵدا دەکرێ. بە نموونە دەڵێم ئەگەر جەنابت خەریکی خنکان بووی لە ئاوێکی خوڕدا و خێرەومەندێک بێئەوەی گوێ بداتە چارەنووسی تێکڕای ئادەمیزاد ڕەحمی پێکردیت و خۆی خستە مەترسی خنکانەوە تا ڕزگاری کردیت ئایا هیچ کارێکی شۆڕشگێڕانە و ئادەمدۆستانە و چاکەخوازی تێکڕای ئادەمزاد پێی دەکرا هێندەی مەردایەتی ئەو تاکە

بەهانەی چارەنووست بێت؟ مەردایەتی و سەخاوەتی حەماغا و غەیری ئەو لە کۆیە و لە جێی دیکەشدا بەو نیگایە سەیری دەکرێ.

نوختەی دووەم ئەوەیە کە بێین و چاکەی تاک یان چاکە لەگەڵ تاکدا بە بەهانەی تەئسیر نەکردنی لە چارەنووسی گەلان بێبایەخ بکەین دەبێ یەکسەر بشسەلمێنین کە خراپەی تاک یان خراپەکردن لە گەڵ تاکدا بێبایەخ بێ، چونکە تەئسیر لە چارەنووس ناکات بەو پێیە چاکە و خراپە دەچنە دەستەیەکی تەرازووەوە کە ئیتر لزوم نامێنێ ددان لە جەردە و خوێنمژ و دەرەبەگ و باخەڵبڕ و سووتخور و... و... بکرۆژین خۆ تەئسیر لە چارەنووس و لەڕەوتی چەرخی عەرەبانەی مێژوو ناکەن!!

ئەمانە دەڵێم بەرانبەر زۆر گوتە و نووسینی قەڵب و بێکەڵک و بێتام و شامی خوێنگەرمی دوور و نزیک کە لە سەری زمانەوە گاڵتە بە هەموو مەردایەتی و لەخۆبووردوویی و غەیرویستی تاکان دەکات تا ئەوەی شەرمی نەکردووە و پاتەوپات گوتوەتی یان نووسیوەتی هەژار تێرکردن خیانەتە بەرانبەر چینی چەوسایەوە، چونکە ڕق و بوغزی برسییان بەرانبەر چەوسێنەرەوە کز دەکاتەوە قەتیش بە خۆی نەگوتووە، ئەرێ یا فایین خۆ هەزاران و ملێونان لە برسی و هەژار بە قاتوقڕی مردن و تووڕەش نەبوون ئیتر بۆ دەبێ کەیفم بەمردنی هەژار بێ یان ڕقم لە چاکەی تاک هەڵبستێ؟

بەهەمەحاڵ چ لە کۆیێ و چ لە شوێنی دیکە بووبێ خەڵقەکە بەتەنگانەی شەڕی یەکەم و گرانیەکەی 1917دا تێپەڕین ئەوەی کوژرا، کوژرا ئەوەی لە برسان مرد، مرد، خواپێداوەکانیش تێیاندا هەبوو هەلی وەرگرت و خۆی بەناچاری خەڵق دەوڵەمەند کرد تێشیاندا هەبوو پارووی لە زاری خۆی گێڕایەوە بۆ برسی و هەژار و بێدەرەتانان منیش و هی وەک منیش کە دەستمان لە هۆشی کوردانەی خۆمان گیرکردووە بە هۆشی ناو کتێبانی نادەین لەو پەڕی سافیلکەییمانەوە هەزار ڕەحمەت و ئافەرین دەنێرین بۆ گیانی ئەو خێرەومەندانەی ڕەحمیان بە لێقەوماو کردووە و چ لە خواترسانەوە

بووبێ و چ لە نیهادی پاکی خۆیانەوە بووبێ باخەڵیان بۆ خزمەتی لێقەوماو بەتاڵ کردووە دەشیانتوانی وەکوو تەماعکاری دیکە جەمە نانێک بە لیرەیەک بفرۆشن.

ساڵانی جەنگ و گرانی بەڵایەکی ناگەهان بوو بەسەر کوردستاندا هات و فرزەی هەزاران هەزاری لە هەژار و لە نیمچە دەوڵەمەندیش بڕی. لە ماوەی جەنگدا لێپرسینەوە و بەسەرگرتنەوەی کاری بەد و زوڵم و زۆری فەرمانبەری حکوومەت هەڵستابوو دەستبڕینی خەڵقی و باغەڵی خۆپڕکردن لەلایەن ئەو مووچەخۆرانەوە بوو بووە دەستوور تا ئەوەی کاریان گەیاندە ڕادەیەک لە شوێنێکی وەکوو کۆیە بە بەرتیل بێگوناح لە جیاتی تاوانبار بەپەتەوە کراوە. کابرای تاوانبار بەرتیلی داوە لە بەندیخانە بەدزیەوە بەرەڵڵا کراوە لە شوێنی ئەو بابایەکی بێکەسیان لە ماڵی خۆی بەشەو دەرهێناوە و بەناوی ئەو تاوانبارە بەرهەڵدراوە خنکێنراوە. تەنها تێبینییەکی ئەو بێئینسافانە لەو مامڵەتەدا کردبێتیان ئەوە بووە کە هاوناوێکی تاوانبارەکەیان بەپەتەوە کردووە وەک ئەوەی کە لە شوێنی بارام بارامێکیان هەڵواسیوە نەک ڕەحمان. لێرەدا پێویستە دوو نوختە ڕوون بکەمەوە. یەکیان ئەوەیە کە مەرج نییە تاوانبار و حوکمدراوەکە لە ڕاستیدا خراپکار بووبێ ڕەنگە لە عەسکەری هەڵاتوو بێ یان لەبێگار و پیتاکدان درێغی کردبێ. نوختەی دیکە ئەوەیە کە حوکمدراوەکە لە ژووری حەبسخانەوە ڕەنگە نەشی زانیبێ جەللادەکان کێی بە قوربان دەکەن هەروەک ڕێی تێدەچێ هەندێک لەوانە لە پەلەی ڕوح قوربانیەکەشی دەستنیشان کردبێ خولاسە بازاڕی شێواو هەموو مامڵەتێکی تێدا دەکرێ.

ئێمە نازانین تاک تاکی ئەو خەڵقە لەوانەی دەسەڵات و سامانیان هەبوو لە ساڵانی جەنگدا چۆناوچۆنی ڕەفتاریان کردووە. گریمان بەدایەتی هەندێکشمان زانی، لە باسکردنەوەی نامەردییان کەس سوودمەند نابێ، کەس و خزمیشیان بێلزوم لە خۆمان دەتۆرێنین. پیاوێکی وەکوو حەماغا کە بەر لە جەنگ ناوی چاکە و سەخاوەت و مەردایەتی بڵاو بووبۆوە لە جەنگ و

گرانیشدا ئەو ناوەی بەردەوام و لەزیاد کرنیشدا بوو، چونکە سەخاوەت و بەهانا هاتنی خەڵق لە ڕۆژانی تەنگانەدا پتر مایەی منەتباری خەڵقە و باشتر جوانمەرد بە ئیسپات دەگەیەنێ. ڕاستییەکەی شۆرەتی سەخاوەتی حەماغا گەییشتە ڕادەیەک بەسەریشیەوە نراوە و حیکایەتی وەهای بۆ هەڵبەستراوە لە بنەڕەتدا ڕووینەداوە بەڵام چ گلەیی لەو ناکرێ بەوەدا خەڵق لەخۆوە پتر بە چاکەیدا هەڵبلێین بە پێچەوانەوە ئەمیش شایەدییەکە بۆ زێدە سەخاوەتی حەماغا بەڵام نابێ لەبیر بکەین کەوا لەگەڵ ئەوەی بەخشندەیی حەماغا بوو بە دروشمی هەموو ناووشۆرەتی تا ئەوەی کە دەبینین کەسی دیکەی دەوروبەری کۆیێ لە تەک ئەودا ناوی نایەت بێگومان کەسانی دیکەش هەبوون هەریەکە بەش بە حاڵی خۆی چی لە دەستی هاتبێ بە چاکە و ناندان دریغی نەکردووە. دەمبیست لە حاجی و توجارانیش هەبوون فەقیر نەواز بوون بەداخەوە ناویانم لەبیرنەماوە خاوەن قۆناغی هەبوون بە درێژایی گرانی قۆناغیان ئاوەدان بوو ئەگەرچی چەورایی و شیرنایی پێش گرانییان کەم بوو بۆوە هەر دەشبوو کەم بێتەوە. وەکوو جەمیل ئاغا کە سامانێکی ئەوتۆشی نەبوو بەمشە لێی سەرف بکرێ، بەڵکوو لەزۆر باردا توشی دەستکورتی بووە پەنجەرەی ژووری ماڵەوەی دەرهێناوە و فرۆشتووەتی بۆ مەسرەف ئنجا ئەگەر لە گرانیدا ئاهی لەجەرگی گەڕابێ بێگومان پشکێکی بە زیادەوەی لێداوەتەوە مێوان و هەژاران پیاوێکی وەکوو باوکم هەتا گرانی بەسەر چووبوو هەموو ئێوارەیەک یەک مەنجەڵی گەورەی ساوار کوڵاندن لە ڕەشەشێو بردراوەتە بەر دەرگەی ماڵەوەی و چەند هەژاری هاتبێ یەک ئەسکوێی گەورەی ڕەشەشێو و یەک نانی دراوەتێ کە ئەمەشی کردووە خۆی بە دوایی لەبەر تەکلیفاتی حکوومەت سەغڵەت بووە تەنانەت جاری هەرە دوایین کە قائیممەقامی تورک ڕوو لە خەڵقەکە دەنێ بۆ پیتاک باوکم کە هیچی ئەوتۆی شک نەبردووە بیکاتە زمانبڕی حکوومەت بە مامم دەڵێ چارەیەکی ئەو ئیشکالە بکات ئەویش لەگەڵ مەئموورەکانی عەنباری حکوومەت ڕێک دەکەوێ بە بەرتیل چەند پریسکەیەکی پۆلکە و گاگۆزیان

تەسلیم دەکات ئەوانیش لە قەپانیان دەدەن و بە گەنم و جۆیان دەخوێننەوە و لە جیاتی «2» کیلۆ هەر جارە کە قەپانەکە دەخوێننەوە دەڵێن 30 کیلۆ 25 کیلۆ و فرێ دەدرێتە عەنباری گەورە کە تاکە یەک دانەی بە حکوومەت ناگات و هەمووی لەلایەن قائیممەقام و مەئموورە زلەکانەوە زەهرەمار دەکرێ. باوکم دەیگوت ئەگەر لەدەستم هاتبایە دروشمی کوردم بە وێنەی «کەنگر» دەڕازاندەوە، چونکە بەهاری ساڵی گرانی خەڵقێکی زۆر لەوانەی زستانەکەیان بردەسەر بە کەنگر لە مردن قوتار بوون.

حەماغا لەو ناوەدا کە ئەویش بە دووایی دووچاری سەغڵەتی بوو لەبەر ئەوەی جێی تەکلیفی لەحەد بەدەر بوو جگە لەوەی ماڵێکی قەرەباڵغ، دیوەخانێکی قەرەباڵغتریشی هەمیشە بەسەر شانەوە بوو لە ئەزموونێکی دائیمیدا بوو لەگەڵ بەرگەگرتن و کۆڵنەدان و پەیداکردن و دەرخوارد داندا. خۆوتالعی ناوە باشەکەی خۆی و تالعی ئەو کەسانەی پێوەندییان پێوەی هەبوو یان لێی نزیک بوون یان دەستی پێیان دەگەییشت حەماغا هەتا بڵێی لە گوزەرانی دنیاییدا کاسب و کابان پوخت و بەلێکدانەوە و بەزیپک بووە دەنا یان دەبوو لە پیاوەتی و سەخاوەتەکەی کەم بکاتەوە یان بە ماڵی خەڵقی پیاوەتی بکات، چونکە ناپوختی و بێباکی وکەمتەرخەمی بە ناچاری دەکێشێتەوە بۆ ناگزووری. ڕاستییەکەی بەش بە حاڵی خۆم کە نەختێک ئاگاداری پێداویستی کەسابەتم و تا ڕادەیەک دەزانم مەڕ بەخێوکردن « لە نووسینی دیکەمدا گوتوومە زیندەماڵ دزبردووی گورگ خواردووی مەرگ تێگەڕاوە» چ ئەرکی گران و خزمەتی هەمیشەیی و تیمارکردن و کۆز بەخێوکردن و... ی بەدواوەیە بەلامەوە لەسەیر سەیرترە حەمائاغا چۆن توانیوەتی لە پیریشدا سەراسۆیی لەو مێگەلە کوێستان و گەرمین کردووانە بکات کە ژمارەی مەڕەکانیان بەهی خۆی و شوانکارەکانیەوە بەلای کەمەوە لە پازدە هەزاری تێپەڕاندووە. تۆ وەرە پازدە ساڵان لە حەبسخانە بەسەر بەرە ئنجا بشتوانە خەفتیانی مەڕ بەخێوکردن و لێ زیادکردنیشی بخۆیت. لە بەغداوە توانیوەتی ڕابەری ئەو کارە دژوارە بێت و بەرەو پێشیشیەوە ببات،

چونکە ئەگەر وەها نەبایە نەیدەتوانی بەداهاتی دەغڵ و شیناووردی ئەوسا ئەو مەسرەفە قورسە لە حەبسخانەی بەغدادا بکات و باری دیوەخانە و مڵک بەڕێوەبردنی کۆیەش دانەلەنگێت. گەلێک خاوەن مڵک و مەڕو ماڵ هەبوون و هەن لەبەر ناوەستایی و مشۆرنەخۆری و کەمتەرخەمی و تەنبەڵی نەیانتوانیوە بە داهاتی حەڵاڵ بەڕێوە بچن ئیتر ڕێگەی نارەوایان گرتۆتە بەرخۆیان و خەڵقی هەناسەساردی بێتاوانیش تێیدا شەکەت بوون. بەر لە شۆڕشی چواردەی تەمووز یەکێکم لەو بابەتە دەناسی و پێشم دەگوت تۆ هەتا کەرێکی دزیاری ساغ دەکەیتەوە بایی نرخی ئێسترێک دەدەیتە دایەرەی پۆلیس و داکەدزانە... بەکورتی مەیلی حەماغا بۆ لای کەسابەت و پەیداکردنی داهاتی حەڵاڵ بنەمای هەموو چاکە و سەخاوەت و جوانمەردییەتی، دەنا ئەگەر ئاغایەکی هەوەسباز و بێباک بووایە هەروەک لە ڕێی نارەواوە ئەرکی مێوانداری و خۆبەدەرخستنی پەیدا دەکرد هەروەهاش سەخاوەت و ناندان و بەر و دیوەخانەشی بۆ خاوەن دەسەڵات و پیاوی حکوومەت دەبوو و بەس، چونکە ئەمەیانە ڕێی دەسدرێژی بۆ زاڵم هەموار دەکات، خزمەت کردنی مرۆی بێدەرەتان چ ئومیدێکی دنیایی لێشین نابێ مەگەر شۆرەتی میرخاسی کە ئەویش لەلای خۆیەوە ڕێی نارەواو بەرەو ستەم لە مرۆڤ دەبەستێ. لە کۆچکردووانی مڵکداری کورد حازم بەگی شەمدینانم بەبیردێتەوە بۆ کابان پوختی و مشوورخۆری و کەسابەت کە ئەویش خوای لێخۆش بێ وەکوو حەماغا حەزی بە ئاوەدانی و کشتوکێڵ و سەراسۆیی داهات دەکرد دوور لە دەسدرێژی و دەردی سەری و بێویژدانی و بەرتیلدان.

ساڵانی جەنگ و گرانی بە چەکمەسەری ئازار و دەردەوە بەسەر هەمووواندا تێپەڕی و حەماغاشی پێوە سەغڵەت بوو تا ئەوەی لە گرانیدا دانەیەک دانەوێڵەی مڵکی خۆی نەما ناردی لە دەشتی دزەییان مامڵەتی دەغڵ کڕینی کرد و لەسەر نرخ لەگەڵ بابای فرۆشیار ڕێک کەوت، بەڵام کە کاروانی وڵاغانی نارد بۆ هێنانەوەی دەغڵەکە فرۆشیار بۆ تەمای نرخی باشتر لە

مامڵەتەکەی پەشیمان بۆوە. کاروان لە گەڕانەوەدا بوو بەتێشووی بەتاڵەوە ئاغایەکی دیکەی دەزیی کە ئاگاداری مەسەلەکە بوو کاروانی بردە لای خۆی و بەو نرخەی بڕیەی لەسەر درابوو دەغڵی بۆ پێوان و بە خزمەتەوە بۆ کۆیەی بەڕێ کردنەوە. ئێمە دوای 68 ساڵ لەو مامڵەتە باسی پیاوەتی دەکەین، بەڵام سەد هەزار جاران حەیف و مخابن ئەو مەدحە لە مەجرای ژیاندا سەد یەکی ئەو تەئسیرەی نییە و نابێ کە زێدە نرخی ئاغاکەی دیکە کە لە مامڵەت پەشیمانی دابوو بە کاریگەرێکی نوێ و خرایە سەر بارستی سامانەکەی و لە کۆمەڵدا خەڵکی بەخۆیەوە خەریک کردووە. ژیان و گوزەران و دەستوورەکانی کۆمەڵایەتی لەگەڵ «هەبوون» دا مامڵەت دەکەن.

بێنە ئیمامی شافیعی بکە بە بەقاڵێکی دووکان بەتاڵ کەس ڕووی تێناکا، چونکە لێی بەمراد ناگەن ئەبوو جەهلیش بکە بە بەقاڵێکی ئیروو عالەم بۆی دەجمن. بەداخەوە لە ئاکامدا بێسامانیی مرۆی جوانمەرد و لەخۆ بووردوو سەر بە هیچەوە دەنێ مەگەر خەڵق بەخێری خۆی باسێکی چاکەی بکات سامانی بەرتیلخۆر و دەستبڕ و جەردە و ستەمکاریش دەبێتە قیبلەگای ئاپۆرەی کڕیار و فرۆشیار و مامڵەتکەر و خاوەن نیازان. خۆڕایی نییە پێشینان گوتوویانە ئانەیەکت نەبێ ئانەیەک ناهێنێت. حەماغاش نانی نەبایە باسی سەخاوەتی نەدەکرا. لەم ڕووەوە من بە فکری خۆم بەرلەوەی قەدرزانی سەخاوەتەکەی بم قەدری ئەو خەسڵەتانەی دەگرم کە ڕوویان پێی وەرگێڕا بۆ لای کەسابەت و داهاتی حەڵاڵ کەوا بەرلەوەی شۆرەت و ناوی مەردایەتی بۆ ئەو پەیدا بکەن دەیان و سەدان هەژاری بێچارەی پێوە بەرخورداری کەسبی بێقەمچی و زللەبوون و بەپێی ئەو ڕۆژگارە مزەی ئەرکی خۆیانیان بەڕەوایی و تەواوی لە کەسەبەکە وەرگرتووە. حاجی قادر چەند ڕاستی فەرمووە کە گوتووەتی:

تەنبەڵی کاری حیز و بێ خێرە
دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە

پەندەکەشی هەموو کەس دەگریتەوە بەهەژار و دەوڵەمەندیەوە. کە قسە لە هەژار بکەین بەشێکی هەرە زۆری ئەو نۆکەر و دەستوپاوەندانەی دەبنە کوتەکی دەستی زاڵم لە بابەتی بلَح و تەنبەڵ و چاولەدەر و سووک تەبیات و لۆتی مەشرەبهە. من نەمدیت ڕەنگە نەشمبیستبیَ فەلاحێکی باوەڕی بە بەرهەمی گاڕەش و گاسن هەبووبیَ یان سەپانێکی لە دەستوقام و داسەکەی خۆی ڕادیتبیَ لووتە خۆری و نۆکەری و چاوەشی بۆ زاڵم کردبیَ لە ئەهلی شاریش کاسبی ڕاستەقینە لە هەر سنفێک بووبیَ بیری لە چڵکاوخۆری ماڵە دەوڵەمەندان نەکردۆتەوە. من ناڵێم فەلاح و کاسبی ئەوتۆیی پاڵەوان بوون لێشیان داواناکریَ زێدە لە عالەم ئەوان پاڵەوان بن. من دەڵێم کەسێکی خەریکی گوزەران بیَ بەو کەسب و کارەی کە بەرژەوەندی ڕاستینەی کۆمەڵی تێدایە ڕێگای ناچێتەوە بۆ لای نۆکەری و زاڵم پەرستی و هەژارکوژی بەپێچەوانەوە، کاسبکار هەر لەتوجار بگرە هەتا سنفی هەرە بەرەژێری کاسبان دژی دەسەڵاتی ناڕەوان، چونکە بەرژەوەندیان لە کاری ڕەواو باری ئاسایی و بازاڕی ئارامدایە. هیچ توجارێک حەز ناکا سەرانەی لێبسێندریَ یان کاروانی لە ڕێگاوباندا ڕووت بکریتەوە یان دزی دەسەڵاتدار بەشەو ماڵی تاڵان بکات.

خولاسە خەریکبوونی مرۆڤ بە گوزەرانەوە هێندەی عیبادەت لە خراپەی دەگێریتەوە ئەوەی بە گوزەرانەوە خەریک نییە مەیلەکەی بەلای گەلۆری و خوێڕیەتی و تەوەزەللی و نۆکەری و دەستپیسییەوەی دەبات لەمەوە و لەهەموو ڕاستییەکی بێفێڵەوە دەردەکەویَ خاوەن سامانی کاسب و بەرژەوەند بین خێر و بەرەکەتی پێوەیە بۆ جیرانیشی تا بشلێی بێزەرەرە لەو چالاکییەی کە بەرژەوەندەکەی پێیەوە بەندە کەسێکی بەڕاستی باوەڕی بە فەلاحەت هەبێت و گوزەرانی خۆی لە زەوی و دانە و گاڕەشدا ببینیَ هەرگیز خەیاڵ ناکا لەوەی ئاگر بە قرشەی دەغڵی کەسەوە بنیَ، چونکە خۆی خاوەن قرشەیە و دەزانیَ چ ئەرکێک ئەو قرشەیەی بەرهەم هێناوە و چەند کەس چاویان لە

دانی ناو قرشەکە و کای کە لێی پەیدا دەبێ بڕیوە تا خۆیان و ئاژەڵیان پێی بژین.

حەماغا بێئەوەی وەکوو من خەریکی لێکدانەوەی فەلسەفی بێ لەخۆوە ئەم ئاکارانەی لێبەدی دەکرا. حەزی نەکردووە بە ناکۆکی. دژی دەسدرێژی بووە، لایەنی تەبایی گرتووە، بەکاسبیەوە خەریک بوە، پیاوی کاسبی خۆشویستووە. بەم خەسڵەتانە و بەسەخاوەتە مەشوورەکەیەوە ساڵانی پڕ تەنگوچەڵەمەی جەنگ و گرانی 1917 ی بردە سەر لە 1918 ئینگلیزەکان بوونە جێگری عوسمانلییەکان. باری حکوومەت گۆڕا و مەئمووری ئەوروپایی هاتنە جێی بەرتیلخۆرە ڕاووڕووتکەرەکانی عوسمانلی خێرا فەقیرخانەیان کردەوە و سیاسەت بێ یان بە پیاوەتی برسییەکان ڕوویان لەو فەقیرخانانە کرد و ئەرکی برسییەتییان لەسەر شانی ناندارەکانی شار هەڵگرت هەر چەند نانداریش هاتبوو بێنان بێ. بێگومان حەماغا لە هەمووان پتر بەو فەقیرخانانە حەسایەوە، چونکە هەندی هەمووان و پتریش ئەرکی بەسەر شانەوە بوو.

کتێبەکەی های «» «دوو ساڵ لە کوردستان» سەرچاوەیەکی بەبایەخە بۆ زانینی تێکڕای باری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئاوەدانی کۆیە و ئەو شوێنانەی دیکەی کوردستانی عێراق کە پێوەندی پێیانەوە هەبووە لەو ساڵانەی تێدا بەرپرسی ئەو هەرێمانە بووە کە وەک خۆی دەڵێ دوو ساڵ دەگرێتەوە. بایەخداریەکەی لەوەوە دێت کەوا باسی ئەوتۆ دەگێرێتەوە خۆی تێیاندا شایەد بووە لەلایەن حەماغاشەوە بەوەدا پتر بایەخ پەیدا دەکات کە لەو ماوەیەدا بەرحەیات بووە. هەرچی کتێبەکەی کورد و تورک و عەرەبی ئەدمۆندسە لە سەردەمێک دەدوێت کە حەماغای تێدا نەماوە. های لەو هەڵە و کەموکوورییە فکرییەی کە لە ئاست هەندێ باری کۆمەڵایەتی یاخود ئاکار و ڕەفتاری کەسانی ئەو سەردەمە دووچاریان بووە لە دوو لایەنی جوداوە سەیری دەکرێ. لایەنێکیان ئەوەیە کە ئەگەر خۆیشی بەزار نەڵێ لە ڕاوێژی نووسینەکەوە دیارە هەندێ بیروباوەڕی بەرانبەر ڕووداو یاخود کەسان، لەخەڵقی ناوچەکە وەرگرتوون، ئیتر ئەو خەڵقە بەپێی دڵ و دەروونی خۆی

شتی بۆ باس کردووە ئەویش لە نووسیندا دەری داوەتەوە. لایەنێکی دیکە ئەوەیە کەوا تەجرەبەی خۆی لە ڕووداو و لە مامڵەت کردن لەگەڵ خەڵقدا دەگێڕێتەوە. ئەم لایەنەیان پتر جێی متمانەیە، چونکە هەرنەبێ مەیل و ئارەزووی حەسوود و ناحەزی ئەو سەردەمە دەستێکی نەبووە لە داڕشتنی نووسینەکە و ڕاگەیاندنەکانی. بە نموونە دەڵێم ئەگەر لە دەموڕاوێژی نووسینەکەی کە باسی چاکە و خراپەی فڵانەکەسی لە خەڵق بیستبێ یاخود تۆمەتێکی وەپاڵ فڵان دابێ شتێک نییە لەخۆوە زانیبێتی، ئا ئەم تەرزە شتانە کەمتر متمانەی پێ دەکرێ لە خەبەرێک یان ڕایەکی یەکسەر لە تەجرەبەی خۆیەوە بۆی پەیدا بووبێ. خۆ ئەگەر بگوترێ کابرا لە هەموو حاڵاندا هەر نوێنەری داگیرکەر بووە لەبەر ئەمە گوێ نادرێتە قسەو بیروڕای. لەوەڵامدا دەڵێم ئەم تێوەرێخە قسەکەم بەرپەرچ ناداتەوە ئەویش لە دوو خاڵەوە. یەکیان ئەوەیە کە گەلێک خەبەر و ڕووداوی ڕاست و بێگومان لەو کتێبەدا هەیە ئیتر داگیرکەرە یان شتێکی دیکەیە کار ناکاتە سەر ڕاستیەکی بێگومان.

خاڵی دووەم ئەوەیە چەندێکی داگیرکەریش بێ دیسانەوە فەرق دەمێنێ لە نێوان هەڵەیەکی خۆی کردبێتی لەگەڵ هەڵەیەکی خەڵق بۆی نابێتەوە، یاخود با بڵێم ئەو هەڵەیەی خەڵق بۆی ناوەتەوە دەبێتە عەیبێکی تازە دەخرێتەوە سەر ئەو لایەنەی کە کابرا داگیرکەرە.

من لێرەدا ناچمەوە بۆ باسی ئەو کتێبە مەگەر بۆ لایەنی ئەو باسانەی پێوەندییان بە حەماغاوە هەیە، لزومیش نابینم لێرەدا دووبارەی ئەو شتانە بکەمەوە کە های باسی کردوون، چونکە دەبێتە کوتانەوەی خەرمانی کوتراو. ئەوەندە دەڵێم، کابرا بە زۆری مەدحی حەماغای کردووە و بەڕێزەوە ناوی دەبات و لەسەرجەمی ڕەفتار و کرداری ڕازییە، زۆریش بە پەرۆشەوە باسی مردنی دەکات. لەدەمی فەرمانڕەوایی کاپتن هایدا حەماغا بووە بە قائیممەقامی کۆیێ هەروەک لە جێگەی دیکەشدا دەسەڵاتداری ئەوتۆ بوونەتە قائیممەقام و کاربەدەست کە بتوانن ئارامی و هێمنی بنێنەوە لە قەڵەمڕەویاندا. بۆ ئەو سەردەمە حەماغا باشترین و لێهاتووترین دەسەڵاتدار

بووە بۆ پڕکردنەوەی ئەو مەرکەزە هەرچەند لەلایەن سەواد و خوێندەوارییەوە دوورەبەش بوو.

حیکایەتی هاتنی نوێنەری شێخ مەحموود بۆ کۆیێ و چۆنیەتی بوونی حەماغا بە قائیممەقام و کشانەوەی نوێنەری شێخ و هاوڕێیانی لە کتێبەکەی های بە درێژی باس کراوە ناشێ لێرەدا دووبارەی بکەمەوە هەرنەبێ لەبەر ئەوەی کە بەشێکی زۆری پێوەندی بە غەیری حەماغاوە هەیە. بەڵام دەبێ بڵێم دوورخستنەوەی کەریماغای مەلاواحیداغای حەوێزی و حەمەدەمیناغای مەلائەحمەداغای غەفووری بۆ سلێمانی لەو دەمەدا کە نوێنەری شێخ مەحموود لە کۆیێ بووە، سەرەڕای بەربەرەکانی شێوە نهێنی لە نێوان حەماغا و نوێنەری شێخ مەحمووددا لەسەر قائیممەقامەتی، واپێدەچێ، نەیکێشابێتەوە بۆ تێکچوونی دۆستایەتی شێخ مەحموود و حەماغا، چونکە وەک باس دەکەن حەماغا ڕاسپادەی بۆ لای شێخ ناردوە داوای هەناردنەوەی حەمەدەمیناغای کردووە،شێخیش بێوەخراندن و بەڕێزەوە تەکلیفەکەی جێبەجێ کردووە.

لە کولانەی دامەزرانی حەماغا بە قائیممەقام سەر بە دیمەنێکی ئاکار و کۆمەڵایەتی خۆماندا دەگرم کە لە نووسینەکەی «های»ەوە ڕەنگ دەداتەوە بێئەوەی های هەستی پێکردبێ.

های دەڵێ حەماغا 115 ساڵ تمەنی ڕابووردبوو قسەکەش هی ساڵی 1920 ز. دەشڵێ بەر لە 80 ساڵ ئاغادەربەند بووە لە دەربەندی ڕەمکان. بەو پێیە دەبێ لە 1840 ز. کە دەوەستێتە بەرانبەر 1255-1256ک. ئاغادەربەند بووبێ وەک لە پێشەوە باسم کرد حەماغا لە دەوروبەری ئەو ساڵەی 1255ک. هاتۆتە دنیا ئیتر چۆن وەها ڕێک کەوت «های» ئەو هەڵەی وەها زل بکات؟

های قسە لە گیرفانی خۆی دەرناهێنێ، هەڵبەت لە کۆییانی بیستووە، جا بۆچی کۆیی پتر لە 30 ساڵ بەسەر تەمەنی حەماغاوە بنێین؟ هەموو باخەبەرانی کۆیێ دەیانزانی تەمەنی حەماغا لەو ساڵەی 1920ز. هەشتاو

ئەوەندە ساڵەیە ئیتر بۆچی دەیبەنە 115 ساڵ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێتە ڕەنگدانەوەی ئاکار و ڕەفتاری کۆمەڵایەتیمان!!

ئەو کەسەی وەهایان بردۆتە مێشکی هایەوە کە حەماغا 115 ساڵ تەمەنیەتی ویستوویانە لەم ڕێگایەوە بیهاوێنە سەر ئەو باوەڕە کە پیاوی وەها پیر ئەرکی قایمقامەتی و بەڕێوەبردنی باری هێمنی و ئاسایشی وڵاتەکەی پێهەڵناگیرێ، مەرجیش نییە خاوەنی ئەو نییازە خۆی مەبەستی بووبێ ببێتە قائیممەقام، ڕەنگە یەکێک بووبێ لەوانەی حەز بە نارێکی دەکەن یان پیشەیان تێوەرێخ هاویشتن و لەمپەر خستنە پێش هەنگاوانە، یان حەسادەتی بێ ئامانج دڵیان دەکولێنێ. عەولاغای حاجی تاهیراغای حەوێزی ویستوویەتی ببێتە قائیممەقام، بەڵام نێوانی لەگەڵ «های» وەها ڕێک نەبووە لەگەڵی دابنیشێت و کاکە و برالەی بەرژەوەندانی پێبکات و قسەی ئەوتۆیی لە گوێ بگوشێ. بەهەمەحاڵ نیازی کابرای کە تەزکەرەی نفوسی بۆ تەمەنی حەماغا دەرکردوە لە نانەوەی ئاژاوە خاڵی نەبووە.

قائیممەقامەتی حەماغا زۆری نەخایاند، بەڵام لەو ماوەیەدا کە قائیممەقام بوو، لە زۆر شوێنی کوردستانی عێراق بێئارامی و هەڵگەرانەوە لە ئینگلیزەکان و شەڕ و کوشتاری بێهوودە دەستی پێکرد. بزووتنەوەکانی ئەو سەردەمە جگە لە هی شێخ مەحموود کە بنەما و بناغەیەکی سیاسی و قەومایەتی پێوە بوو ئەوانی دیکە بریتی بوون لە نارەزامەندی سەرەک عەشیرەتەکان کە تەنها ڕەواییەکی بەو نارەزامەندییانەوە بووبێ ئەوە بووە کە یەخەگیری بێگانە بوون هەر چەند لەو مەیدانەشدا وەها بووە بێگانە و خۆماڵی تێک بەستراون و وێکرا پێکراون چینی هەژار لەو بزووتنەوانەدا، بەداخەوە تێنەخوێنراوەتەوە قائیممەقامەتی و دەسەڵاتی حەماغا توانیوەتی لە ماوەی ژیانیدا کۆیێ بەئارامی بهێڵێتەوە. لەو ماوەیەدا «های» بۆتە حاکمی سیاسی هەولێر. لە ڕۆژی 1 ی ئابی 1920 برووسکە لە جەمیلاغا، معاونی قائیممەقام وەردەگرێ کە حەماغا زۆر نەخۆشە پێویستە بە فرۆکە پزیشکی لە بەغداوە بۆ بهێنن، بەڵام بۆ

سبەینە برووسکەی دووەم خەبەری مەرگی حەماغای پێدەدات. حەماغا لە 1920/8/2 کۆچی دوایی کرد.

دوای ئەو جەمیلاغا بوو بە قائیممەقام. کاپتن های پاش تازیەی برایماغای دزەیی دەچێتە کۆیێ و سەرەخۆشی لە غەفوورییان دەکات و دەبینێ کاکەزیاد لە مەجلیسی تازیە دانیشتووە.

حەماغا تاقانە کورێک و هەشت کچ لە دوا خۆی بەجێ دەهێڵێ. تاکێک لەو کچانە بێپشک ناکرێن لە میرات، بەڵام بەڕەزامەندی هەموویان دێی خدران بەنامەی براگەورانە بۆ کاکەزیاد جودا دەکەنەوە و نایخەنە سەر میرات.

لە دایکی خۆمم بیستووە دەیگوت لەسەرەمەرگدا بۆ دوایین جار حەماغا بە هۆش هاتەوە و بە خەڵقەکەی گوت 100 لیرەم لای ئایشە (داکی کاکەزیاد» هەیە... بێهۆش بۆوە و گیانی سپارد. ئایشەخان لە پەرۆشی کوڕەکەی تووکێکی لە حەماغا کردبوو گوتبووی ئاخر تۆ تاقانەت هەیە مەسرەفی بەملەوەیە چ دەبوو ئەو 100 لیرەیە دەنگی لێنەکرابایە...

کێلە قەبری حەماغا نووسینی بەسەرەوە بوو، بەڵام لەو ساڵانەدا کە خوێنی گەنجی چەپرۆ دەکەوتە جۆش کێلی قەبری ئەو و هی دیکەش وردوخاش کراو بە نووسینەوە تێچوو. یەکێک لە کۆییان کاتی خۆی، پێش وردبوونی کێلەکە، بایی تاقەتی خۆی نووسینەکەی خوێندبۆوە و لای خۆی پاراستبووی بەڵام داخم ناچێ زۆر بەشەتوپەتی خوێندبوویەوە. شکڵ نووسی ئەو نووسینە بۆ من هات، چەندێکی ویستم بیگێڕمەوە بۆ ئەسڵە قاڵبی خۆی بۆم نەلوا. دییارە نووسینەکە شیعرە بەڵام لەبەر کەموکووڕی نەقڵکردنی هەم لەلایەن کێشەوە هەمووی وەکوو یەکدی نین هەم خوێندنەوەشیان لەنگولۆرە بە تایبەتی هی دوو مەسرەعی(مصراعی» سەرەتا. والێرەدا وەکوو خۆی شکڵ نووسی دەکەمەوە:

غفوری زادە محمداغا

باز این چە اتەشن بر مزود

از مز من کون وجود

زدشعله بر چرخ کبود

روی زنی «زمین» پر شد زد «ز دود»

پیک أجلت نزیل شد

ملک وملک تبدیل شد

ئەو دوو وشەی «زمین، ز دود» من لە خۆمەوە مسرەعەکەم پێڕاست کردەووە. دییارە وشەی «اتش»ی فارسی بەو جۆرەی لە سەرەوە دەردەکەوێ «اتەشن» لە هەڵەی نووسەرەوەیە. ڕەنگە مسرەعەکە بەم جۆرە بووبێت: «باز این چە آتش برفزود».

وشەی «مزمن» لە مسرەعی دووەمدا «خرمن» بووە و بەهەڵە خوێندراوەتەوە. دەمێنێتەوە «کون وجود» تۆ بڵێی ئەویش «کون وجود» نەبووبێ.؟

دوو بەیتەکەی بەرەژێر گرفتی تێدا نامێنێ ئەگەر وەک من ڕاستم کردۆتەوە بخوێندرێنەوە. بەڵام بێگومان شیعرەکە لەوەندە کۆتایی نایەت، چونکە بە عادەت نووسینی سەر کێلەقەبران بە مێژووی مەرگی خاوەنەکەی کۆتایی دێت. دوور نابینم پاشماوەی دێڕە شێعرەکان لە کێلی لای پێیینگانی قەبرەکە نووسرابێ ئیتر یان زووتر فۆتاون یان نووسەر لە بیری کردوون.

باوکم لە تەئریخی مەرگی حەمائاغا چەند بەیتێکی بە فارسی هۆنیوەتەوە من دوو بەیتی کۆتاییم لە بیرن:

پی تأریخ جستجو کردم

باز الاشهب بە گریە لب بگشود

تأسف محمد اغا مرد

بهر تأریخ این قدر فرمود

ڕستەی «محمد آغا مرد» بە لێکدانەوەی ئەبجەد 1338 ک. دەگرێتەوە کە دەوەستێتە بەرانبەر 1919- 1920ز. نووسینەکەی کاپتن های ڕوونی کردەوە کە لە 1920 بووە نەک 1919 ئەوەندەی من بزانم باوکم تەنها بۆ مەرگی حەماغا بە شیعر تەئریخی سازداوە.

حەماغا چۆن باس کراوە؟
خەڵق چۆن ناوی هێناوە؟

لە پێشەوە چی لە باوکم بیستووە دەربارەی حەماغا و لە بیرم ماوە دەوری دەکەمەوە بۆ گوێگر و خوێنەری کورد ئنجا لە کەسانی دیکەوە باسی حەماغا دەگێڕمەوە، بەڵام داخم ناچێ، ئەوەی بە بیرم ماوە کەمێکی کەمە لەوەی بەر لە 40 ساڵ پتر باوکم لە باسی حەماغای بە مەجلیس دەگێڕایەوە. بایەخی ڕیوایەتی یەکێکی وەکوو باوکم لەوەدایە کەوا بەهۆی یەکدی دیتن و بەیەکەوە دانیشتن و گفتوگۆ و ڕاوێژکردنەوە پتر لە نزیکەوە شارەزای ئاکار و کرداری دەبێت و زیاتر بە دەروونی ئاشنا دەبێت، چونکە تەنها دیمەنی دەرەوەی کردەوان، هەموو جارێ نابێتە ڕەنگدەرەوەی ژوورەوە تەنانەت زۆر جاران سەخاوەت و چاکە بە پلان و بۆ مەبەستی نهێنی لەکار دەهێندرێن لەمەش بترازێ یەکێکی وەکوو مەلای گەورە لە خۆرایی و لەسەرڕەوی و ڕواڵەت بینییەوە بیروڕا بەرانبەر کەسان و ڕووداوان هەڵنانێ هەڵبەت عەیارەیەکی وردترو ڕاستگۆتر لەهی کووچە و بازاڕ و قۆناغانیش بەکار دەهێنێ بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندن.

لەوەتەی بیر دەکەمەوە دێتەوە یادم، باوکم بایی ئەوەی پێی بگوترێ فەرامۆش نەکردن باسی حەماغای کردووە. ڕاستییەکەی یەکێک بوو لەچەند کەسێکی سەر بە ئایین و سەر بە دنیا کە پایەی تایبەتییان هەبوو لە دڵی باوکمدا وەکوو مەلائەفەندی، سەیدئەحمەدی خانەقا، شێخ عەلی تاڵەبانی و شێخێکی بریفکانی (کە ناویم لەبیر نەماوە». لە پیاوانی دنیایی غەیری حەماغاش هەبوون کە بایەخیان لای باوکم هەبوو، بەڵام هەرچی حەمەئاغا

بوو پایەی بەلای پیاوە ئایینەکاندا دەهاتەوە لەبەر خەسڵەتە زێدە دەگمەنەکانی وەک سەخاوەت و ڕاستگۆیی و دەستخاوێنی... لەوانەی خزم بوون شێخ مارفی هەڵەجە و شێخ عەزیزی شێخ مارف و حاجی سەییدگوڵی سندۆڵان و ڕەشیداغای حاجی بەکراغای هەرگیز فەرامۆش نەکردن.

لەبارەی حەماغاوە دەیگوت ئەو پیاوە لە سروشتیدا ترس خەڵق نەکرابوو سەخاوەتیش پشکێکی نەترساویەکەی بوو لە فەقیری و بێنانی نەدەترسا ڕاستگۆیی و ڕاستڕۆییش دیمەنێکی نەترساوی بوو کە باکی بە ئاکامی ڕاستی نەبوو.

من لەلای خۆمەوە ئەو قسەیەی باوکم لێک دەدەمەوە و دەمگەیەنێتە باوەڕکردن بەوەی کە یەکێک لە پیاوی حکوومەت و خاوەن دەسەڵاتی دینایی نەترسا بەڕاشکاوی لەگەڵ هەژاردا جوانمەرد و بەپەرۆش دەبێ، چونکە ئازایی لەوەدایە کە لەگەڵ بێدەسەڵات لەسەرەخۆ بێت. باوکم گوتی شەوێک لەشەوانی ڕەشەبای هاوینە ئاگر لە دار و چرووی سەر بازاڕی «مەیدانی سەرێ» بەربوو لە ماڵی ئێمەوە ئەو شوێنە 70- 80 مەتر دوورە هووڵەڵی بڵێسەی ئاگر زمانەی دەکێشا خەڵق دەهەشتی لێدەنیشت، تەنها ئاوێک هەبووبێ بۆ ئاگرکوژی ئەوە بوو لە حەوزی خانی مەحموداغادا بوو کە دەرگەی لەناو بازاڕەکەدا بوو، بەڵام داخرابوو چەندێکی عالەم هاواری کرد بۆ دەرگەکردنەوە خانچی و خەڵقەکەی ژوورەوە خەبەریان نەبۆوە ترس غەلەبەی کرد لەوەدا کە ئاگرەکە بە دەوری خۆی پەرەبستێنێ چ چاریش نەبوو لەو دەمە تەنگانەیەدا، حەماغا پێڕاگەییشت و لەبن تاقی سەرووی بازاڕەکەوە بێدوودڵی و لێوەستانەوە ڕووی لەو جەهەنەمە کرد کە لەسەرەوەی بڵێسە و لە ژێرەوەش پشکۆ و بزووت و پووشی سووتا و زەوێکەی داپۆشی بوو چەندێکی ئەو خەڵقە ویستیان پێشی لێبگرن و لە ئاگرەکەی بگێڕنەوە گوێی نەدانێ و دارعەسای لێهەڵتەکاندن و بەناو ئەو ئاگربارانەدا ڕۆیی هەتا گەییشتە دەرگەی خان ئیتر بە دەرگە لێدان خانچی بەخەبەر هێنا و دەرگە کرایەوە و لەلای بێ ئاگرەوە خەڵقەکە خۆیان گەیاندە

ئاوی حەوزەکە و سەدان کەڵەکەیان لەسەر ئاگرە کرد بە ئاوەوە هەتا کوژاندیانەوە.

گێڕایەوە بەهارێکیان دەمی داچاندنی قاڵبە برنج باوکم لە قەنبەرانی جەلیزادان دەبێت و نیوەڕۆیەکیان سەردانی حەماغا دەکات کە ئەویش بۆ برنج داچاندن هاتبوە بیتوێن. گوتی نان داندرا و لە خواردندا بووین حەماغا دەستی چەپەی لەنێو ڕاناندا دەبزوات و خەریکی خواردنیش بوو. کە لە خواردن بووینەوە حەماغا گوتی، ئەرێ هەرامە، مەڵێن حەمەد بێ ئەدەبە، لەکنم مار بوو لەناو شەلوارم... دەستی برد لە دەلینگی شەلواریەوە کلکی مارێکی ڕەشی گرت و دەری کێشا. تومەز کە دادەنیشێتە سەر سفرە هەست دەکا لەناو شەلواری مارێک دەجووڵێ. دەستی چەپەی بۆ دەبات خۆو بەخت ملی مارەکەی بەردەکەوێ ئیتر بە دەستی ڕاستە نان دەخوات و بەدەستی چەپەش خەریکی خنکاندنی مارەکە دەبێ، نەیویست وەزعی مێوانان لەکاتی خواردندا تێک بدات. سەیر لەوەدا دەبێ، زۆر نابات یەکێک لەوانەی بەخزمەتی خەڵقەکەوە خەریک بوون لەنکاو هاواری کرد. مار خواردمی و دۆخینی ڕانکی بەزاند و دایماڵی دەرکەوت نەمار بوو نەهیچ، دۆخینی چووبووە ناو ڕانکی لەڕانی خشابوو، ترسی مارەکەی حەماغاشی لەدڵدا بوو دۆخینی خۆی بەمار تێگەییشتبوو.

هەر لە باوکم بیست، لەئاهەنگێکی ڕەسمی حکوومەتی سەردەمی عوسمانلییان گەلێک گەپ و سواری و هونەری جۆراوجۆر بەکاردێت تا دەست دەکرێ بە ئاگربازی. حەماغا بەخۆی و دەستەوە و دایەرەی خۆی و چەند مێوانێکی جاف دێنە ئەو داوەتە. دەمی بە مۆدنەی قەننەکەوەی بووە وەها ڕێک دەکەوێ دەستەیەک فیشەکەشێتە بە ئاگر دەکرێ و هەڵدەدرێ و دێت بە سینگی حەماغاوە دەنووسێ ئەویش سینگی واری بووە فیشەکەشێتە لەسەر گۆشتی ڕووت دەتەقن. حاجی عەبدوڵڵای باش توجاری ئەوسەردەمە بەپەرۆشەوە بەرەو حەماغا دەڕوا پاکەتە فیشەکەشێتەکەی لێبکاتەوە. حەماغا چاوێکی لێسوور دەکاتەوە و بەرەو شوێنی خۆی دەیگێڕێتەوە. سەد

فیشەکەشێتە بەسەر سینگییەوە تەقینەوە بێئەوەی دەم لە مۆدنەی قەننەکەی هەڵگرێ. خەڵق تا ئێرە ئاگاداری ئەم ڕووداوەن، بەڵام نازانن بۆچی حەمائاغا نەخۆی ئاگرەکەی لادا نەهێشتی خەڵق بۆی لابدا؟ قەوارەی برینەکەی سەر سینگی چەند مانگێک دەرمان کرا هەتا چاک بۆوە ئیتر بۆچی ئەم پێداگرتنەی لەسەر زامدار بوون؟

باوکم لەگەڵ حەماغادا بەدرێژایی تەمەنی دووای باوکی حاجی مەلاعەبدوڵڵا کراوەبوو، لەهەموو کارێکی دنیایی و عادەتی و ناعادەتیدا بێ پێچوپەنا لەگەڵی دواوە و وەها بووە بە توندیش قسەی لەگەڵدا کردووە بەڵکوو بەولای توندییەوە تێی هەڵپێچاوە، بەڵام لەوەدا هەم لە خۆی ڕادیتووە هەم مەبەستێکی نهێنیی نەبووە هەم حەماغاش بەوپەڕی دڵی فەڕاحەوە گوێی بۆ شل کردووە. ئنجا پاش ئاهەنگەکە باوکم لە حەماغا دەپرسێ تۆ بۆچی نەتهێشت ئاگرت لە یەخە بکەنەوە؟ حەماغا گوتبووی، ئەرێ ئەو مێوانانەم (مەبەستی لە جافەکان بووە» لە ئاگر بازییەکە ئەوەندە زراوڕژاو بوون بە خۆمدا دەشکامەوە. تومەز جافەکان پێشتر ئەو تەرزە پلێتبازی و فیشەک تەقاندن و یاریکردن بە ئاگریان نەدیتبوو مرۆش لە باری وەهادا دەشێوێ ئەوانیش ڕادەچڵەکێن و پەنایان دەبردە بەر تەخت و کورسی و تێیاندا هەبووە خۆی لە بن مێز شاردۆتەوە. حەماغاش زۆری پێناخۆش بووە مێوانەکانی ترسیان پێوە دیار بێ وەک بڵێی ترسی ئەوانی لەسەر خۆی حیساب کردووە ئیتر بە گوێنەدانی فیشەکەشێتەکان لەنگەری بۆ ترسی مێوانەکان ڕاگرتووە. وەک دەبینیت نەترساوی چ پایەکی هەبووە لە سروشتی حەماغادا.

یەکێک لەو ڕێکەوتە دەگمەنانەی بەر چەند دێڕێک پەنجەم بۆ ڕاکێشا دەشێ ببێتە نموونەی خەسڵەتێکی حەماغا و پایەی ئەو خەسڵەتە لە نرخاندنی باوکمدا ئنجا ببێتە نیشاندەری ڕادەی سەراحەتی باوکم لەگەڵ حەماغادا. باوکم گوتی حەماغا نەک هەر باسی چاکە و بەخشینی خۆی نەدەکرد، بەڵکوو تا بڵێی پێش سەخڵەت دەبوو کە باسی چاکەی کرابایە لە

ڕووی خۆیدا. گوتی جارێکیان مافوورێکی نارد بۆ مزگەوتی گەورە زۆری نەبرد لە شتێکدا دڵم لێی گەردی گرت. (باوکم باسی ئەو شتەی کرد کە هۆی دڵگرانیەکەی بووە بەڵام داخەکەم بەبیرم نەماوە چی بووە». گوتی لە ڕۆژێکی هەینیدا کە ژوورەکەم لە مزگەوتی گەورە ماڵا ماڵی ئەشرافەکان بوو، قسەم هێناوبرد هەتا گەیاندمە ئەو شتەی لێی ناڕازی بووم ئنجا ڕووم لە حەماغا کردو پێم گوت، ئاغا هەموو چاکەی تۆ مافوورێکە بۆ مزگەوتت ناردەوە، خزمەتکارێکت بنێرە با بۆت بهێنێتەوە. باوکم گوتی حەماغا وەها تێکچوو سنووری نەبێ و پێی گوتمەوە بریا خەنجەرەکەت لێدابام باسی ئەو مافوورەت نەکردبایە گورجیش سەبەبی دڵگرانیەکەمی چارەسەر کرد.

جارێکیان حیکایەتۆکەیەکی ناو کۆنە کتێبەکانی بۆ دەگێڕێتەوە، گۆیا پیاوێکی گەورەی عەرەبی سەردەمی عەباسیەکان لەماڵی خۆی لەگەڵ مێوانان جەم دەخۆن، دەبینێ موویەک بە پارووی مێوانێکی ئەعرابییەوەیە ئەویش پێی دەڵێ، براعەرەب پاروەکەت موی پێوەیە. عەرەبەکە پاروەکەی دادەنێتەوە و دەڵێ نانی کەسێک ناخۆم موو بە پارووی مێوانەوە ببینێ حەماغا سوێند دەخوا دەڵێ جەنابی مەلا لەوەتەی خۆم ناسیوە تەماشای دەست و پارووی مێوانم نەکردووە.

باوکم دەیگوت حەماغا نەوسن نەبوو، بەڵام حەزی لە خواردنی چەور دەکرد. وەها دەبوو کە بەیەکەوە نانمان بخواردایە دەمدیت بێپەروا کوتە گۆشتی قەڵەو بە بەزەوە دەکاتە پاروو، منیش دەمگوت ئاغا بۆت باش نییە. دەیگوت لێم گەڕێ خوا چی کردبێ هەر ئەوە دەبێ. بابم بۆ خۆی لە دوای زەدەبوونی میعدەی لە جحێڵیەوە پارێزی لە خواردنی چەوەر دەکرد، حەماغا بەساڵدا چووبوو بۆیە لێی بەپەرۆش بوو.

هەروەها لە موناسەبەی خواردن و پارێزدا بەبیرم دێتەوە باوکم دەیگوت لە داوەت و لە سفرەی تازیان کە لەگەڵ حەماغا بەیەکەوە باینایە هەتا دەستی لە خواردن هەڵنەگرتبایە سفرەم بەجێ نەدەهێشت پێی دەگوتم، ئەگەر

لەگەڵ تۆدا نان بخۆم تێر دەبم دەنا ئەو منداڵ و پالانە وەها زوو دەست هەڵدەگرن پیاو شەرمی بەخۆیدا دێتەوە، دواییش کە دەچنەوە ماڵێ پێدا دێنەوە.

باسێکی سەر بە نوکتە

باوکم گوتی لەدەمی جەنگدا پۆلیسان دوو تفەنگیان بە نامەی بێ ئیجازەیی لە پیاوی حەماغا ستاندبوو چەندێکی خێرخوایان تکا و موراجەعەیان کرد بێسوود بوو گوتی ڕۆژێکی جومعە (هەینی» کە حەماغا و مەزنە پیاوەکان دەهاتنە ژوورەکەی من و هەر لەوێش نوێژی جومعەیان دەکرد، پێم گوت ئاغا وابزانم ئەو ئیشە هەر بە خاتوو فلان و فلان (دوو ئافرەتی بێپەردە بوون و زۆری مەئمووران دۆستیان بوون» ڕادەپەڕێ واباشە ئەوان هیممەتێک بکەن. حەماغا چ دەنگی نەکرد. حەفتە وەرسووڕاوە لە ڕۆژی جومعەی ئایندەدا (داهاتودا» کە جەماعەت هاتنە لام حەماغا گوتی خۆ وەکوو فەرمووت وەها دەرچوو، جومعەی پێشوو قسەکەتم زۆر لێگران هات ئەمما ئەو ڕووسوورانە لەخۆوە بە قسەکەیان زانیبوو چووبوونە سەر دایەرەی پۆلیس تێرجنێویان کردبوون و هەر دوو تفەنگیشیان لێوەرگرتنەوە و بۆ پیاوەکانیان هەناردبوونەوە.

لێرەدا ڕووداوێکی بچووک دەگێڕمەوە تاڕادەیەک لەبەراووردکردندا پایەی ڕێزی حەماغا لای باوکم نیشان دەدات:

کە ئینگلیز دەبنە خاوەن دەسەڵات و بەرپرسی موراجەعەی خەڵق باوکم گوتبووی پێویستە لە مسڵمانان چەند کەسێک فێری زمانی ئینگلیزی ببن هەتا بێ نێوانجی لێیان تێبگەین. هەندێک لەمەلاکان لای حەماغا گوتبوویان ئەم قسەیە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام ناگونجێ، ئەگەر ڕێمان بدەی ڕۆژی جومعە کە فلانە کەس دێتە لات قسەکەی لە ڕوو دەدەین. وادییارە مەلاکان دەربڕینی قسەکە لە دەیوەخانی حەماغا و بە ئیزنی ئەو پەسەندتر

دەکەن بۆ تەقوییەی هەڵوەستیان نەک بچن لە شوێنێکی دیکە کە هێندەی ماڵی حەماغا بەسێبەر نییە یەخەی مەلای گەورە بگرن.

حەماغا ئەگەر لە دڵدا مەبەستێکیشی هەبووبێ لە ڕواڵەتدا پێیان دەڵێتەوە شتێکی عەلاقەی بە شەریعەتەوە هەبێ چ گلەیی تێدا پەیدا نابێ. ڕۆژی جومعە مەلاکان بەر لەدەرچوونی باوکم لە دەیوەخانی حەماغا دادەنیشن خولاسە دوای پێشەکی و ڕێ خۆشکردن بە باوکم دەڵێن بیستوومانە فەتوات داوە کە حەڵاڵە زمانی ئینگلیزان فێربین. مسڵمان لە کوێ ئینگلیزی کافر لە کوێ. باوکم سێ جاران لێیان دەپرسێتەوەو دەڵێ، من گوتوومە فێربوونی ئینگلیزی جایەزە؟ ئەوانیش وەک چاوەڕوان دەکرێ دەڵێن بەڵێ وەهات گوتووە. بابم دەڵێ چۆن لە من دەوەشێتەوە بڵێم جایەزە بۆ مسڵمانی وەک ئێمە فێری ئینگلیزی ببێ؟ من گوتوومە فەرزە!! ئەمە دەڵێت و ڕوو لە مامم دەکات و پێی دەڵێ نووڕەددین برۆ لە فڵانە شوێنی کتێبخانە فڵانە کتێبم بۆ بێنە ئەمما نەوەخرێ. مامم لەچەند دەقیقەیەکدا کتێبەکە دەهێنێ بابم پێی دەڵێ فڵانە شوێنی کتێبەکە بکەوە و بیخوێنەوە، کە دەیخوێنێتەوە، دەردەچێ فێربوونی زمانی بێگانە و هەرشتێکی مسڵمانان کاریان پێی بێ لە شێوەی «فرض الكفاية»دا دەبێ هی ئەوتۆ هەبن فێری ببن دەنا تێکڕای مسڵمانان گوناحبار دەبن. مەلاکان لەسەری نارۆن دوای هەڵستانی بابم حەماغا پێیان دەڵێ ئەگەر شتێکی لێی دڵنیانین بۆچی خۆتانی لێدەدەن.

ئەم ڕەفتارە کە دژی بابم لە دیوەخانی حەماغادا کرا یەک تۆسقاڵ کاری نەکردە سەر ڕێز و مەحەببەتی بابم بۆ حەماغا تەنانەت ڕووداوەکەشم لە خۆی نەبیست و هەرگیز باسی نەکرد خەڵقی دیکە بۆیان گێڕامەوە.

بەلای باوکمەوە حەماغا مرۆیەکی لە خواترساو و باوەڕ بەئایین بوو، ئەو پەرستنەی دەیکرد لەدڵەوە بوو نەک لە ڕواڵەت چاکە و سەخاوەتیشی کە بە زۆری ڕووی لە هەژار و بێدەسەڵات دەکرد تا ئەوەی لە دیوەخانەکەی بۆ هەمووان یەک جۆرە خواردن پێشکەش دەکرا بەلای خواناسیندا دەچۆوە،

چونکە ئەگەر لایەنی عەقیدە لەگەڵ سەخاوەتدا نەبێ دەوڵەت پارێزیی و بەرژەوەندی دنیایی داخوازی دەکا کە خزمەتی دەسەڵاتدار بەولای خزمەتی بێدەسەڵاتەوە بێ. بەڵێ دەشێ لایەنی بەخۆدا ڕاپەرموون و شەرم لەخۆ کردنەوە وەها بکات پیاوێکی وەکوو حەماغا بە عەقیدە، لەخۆی بەکەم بگرێ فەرقی خزمەتی دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات بکا هەر نەبێ لە ترسی تۆمەتی ڕیاکاریی، بەڵام چ مانیع لەوەدا نییە عەقیدە و جوانمەردی بەیەکەوە کۆببنەوە ئنجا ئەگەر فەرق نەکردن لە خزمەتی ئاپۆرەی خەڵق بایی ئیسپاتی ئەو ڕاستییە نەکات خەسڵەتی دیکەی وەکوو بەهانا ڕاگەیشتن و بەزەیی و دەسپارێزی و عیبادەت و ڕێز لە فەقێ و مەلا نان و بەجێهێنانی فەرمانەکانی شەریعەت تێکڕایان پاکانە بۆ حەماغا دەکەن کە بێڕیاییەکەی لەگەڵ عەقیدە جووت ڕۆییشتووە نەک لەگەڵ خۆنواندن و فیزلێدان و چوونە ناو چاوی خەڵق.

بابم لەزۆر ڕووەوە باسەکانی حەماغای دەگێڕایەوە بەڵام من بەمەندەی تازە لێی بوومەوە ئیکتیفا دەکەم هەم لەبەر ئەوەی کە بەشێکی ئەو باسانە لەوانەن بەقسە دەگوترێن و لە مەجلیسدا گێڕانەوەیان بەتامە نەک بە نووسین هەم لەبەر ئەوەی کە باسی ئەوتۆیان تێدایە خەڵقی دیکەش لێیان بیستراوە یان هەر نەبێ هی وەک ئەویان لێبیستراوە. بەڵام لەلای خۆمەوە لە جیاتی خوێنەر بەتێوەرێخ ڕەخنەیەک لە خۆم دەگرم لەوەدا کە گوتم سەخاوەتی حەماغا دەچێتەوە بۆ خەسڵەتی نەترساویەکەی کە بابم پێش هەموو خەسڵەتەکانی دیکەی حەماغای دەیخستەوە. ڕەخنەکە بریتییە لەوەی کە دەسی بەدکاریش سەخی و نەترساو بێ، واتە مەرج نییە هەموو جاران سەخاوەت لە مرۆی نەترساوی پەسەند کردارەوە دەرکەوێ ڕەخنەکەش جێی خۆیەتی و بەرلەوەی خوێنەر لێمی بگرێ من لە جیاتی ئەو لە خۆمم گرت، بەڵام هەر نەبێ لە دوو نوختەوە ڕەخنەکەم لێدەتەکێتەوە. نوختەی یەکەم ئەوەیە، من نەمگوت ناشێ بەدکار سەخی بێ، چونکە لەوانەیە ئەسڵی سەخاوەتەکە لە نەترساوییەوە هاتبێ، بەڵام لای هەندێ کەس بەرێژگەی

بەدایەتیدا بڕوات و لای هەندێکی دیکە بەرێژگەی پەسەندایەتیدا. نوختەی دووەم ئەوەیە کە مرۆی بەدکار لێی دەوەشێتەوە سەخاوەتەکەی بەزوڵم و زۆر و دزی و ڕێگری بەرێوە ببات کە ئیتر نرخێکی پێوە نامێنێ و نەبوونی لەبوونی چاکتر دەبێ. لەم خاڵەیاندا سەخاوەتی بەدکار و سەخاوەتی مرۆی ترسنۆک لە هەندێ ڕووەوە بەیەکدی دەگەنەوە. نەبەدکار و ترسنۆکیش لێیان چاوەڕوان دەکرێ بەخشندەیییان لەماڵبەخشین تێپەڕ بکات بۆ خۆخستنە مەترسییەوە لە پێناو لێقەوماودا. ڕاستییەکەی بەهاناهاتنی لێقەوماو بەرگێکە بەبەر نەترساوی پەسەندکردار بڕاوە، خۆ ئەگەر نەترساوی بەدکار لە بارێکی ناز و فیزدا بەهانای خەڵقیش ڕابگات لەوانەیە لە عەینی بەهانا هاتنەکەدا ماڵی مرۆی بێتاوانی بێدەسەڵات کاوول بکات. دەک زاڵم زەواڵەت بێ، دەک نەخۆت بیت و نەچاکە و بەهانا ڕاگەییشتنت...

چاکەو سەخاوەتی حەماغا بە ڕووپێوێکی بەرینی کوردستاندا بڵاوبۆتەوە تە ئەوەی دەتوانم بڵێم تێکڕای ئەو باسانە گەلێک پترە لەوەی من لە بارەی حەماغاوەی دەزانم. لەسەرچاوەی بڵاوکراوەدا جگە لە کتێبەکەی کابتن های ماموٚستای کۆچکردوو عەلائەدین سەجادیش وەک بزانم لەڕشتەی مرواری (یان نووسینێکی دیکەی»دا باسی سەخاوەتی حەماغای نووسیوە. من نووسینەکەم نەدیتووە، بەڵام بیستووشمە و دیتووشمە لە سەرچاوەی دیکەدا هێمای بۆ کراوە. بەو دواییە کتێبێکی ماموٚستا زیوەری شاعیری نەمر بەپێشەکی و پەراوێزکاری کاک محەممەدی مەلاکەریمەوە، بە یارمەتی ئەمینداریەتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان بڵاو کرایەوە لە ژێر سەرناوی «گەنجینەی مەردان و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری» باسی پیاوەتی چەند مرۆیەکی کورد دەگێڕێتەوە لە نێوانیاندا حەماغای غەفوورییە. نزیکی سێ لاپەڕەی لەسەر نووسیوە بایی ڕەنگدانەوەیەکی ئاکارەکانی ئەو مرۆیە دەکات کە ماموٚستای نەمر خۆیشی لە بەرەو کۆتایی ئەو لاپەڕانەدا دەڵێ:«ئەمانەی من نووسیومن بە نەزەر پیاوەتیی ئەو قەترە بە دەریایە» لەدوای چوار دێڕی سەرەتادا ئەم دوو بەیتەشی بە مەدح هۆنیوەتەوە

حەماغای کۆیە مەردی بوو هونەروەر
تەبیعەت بەرز و خاوەن فکری ئەنوەر

لە بۆ مێوان و موحتاجینی ناو شار
دیواخانی موهەییا بوو بە یەکجار

بەدوا ئەمەدا دەڵێ: «مەردێ بوو ڕەعیەت پەروەر، میهمان نەواز، دۆستی ئەهلی فەزل و عیلم». ئنجا دێتە سەر گێڕانەوەی هەندێ لە کردارەکانی و لە ئاکارەکانی. لەپێشەوە باسی مێوانێک دەکات کە وڵاغەکەی دەتۆپێ و پارەی نابێ وڵاغی پێبکڕێتەوە، هەموو ڕۆژێ بە عادەتی خۆی ئالیکی بۆ وڵاغی تۆپیوی وەرگرتوە هەتا ئەوەندەی کۆکردۆتەوە کە فرۆشتووەتی وڵاغێکی تازەی بەو پارەیە کڕیوەتەوە، لەو ماوەیەشدا کەس لێی نەپرسیوە کوا وڵاغت. پاش ئەمە باسی بەرهەڵستی کردنی حەماغا لە زوڵم و زۆری شێخ بزێنییەکان دەکات هەیا لەبەری وڵاتی کۆیەیان دەپەڕێنێتەوە بۆ بەری وڵاتی خۆیان لە هەرێمی سەر بە کەرکووک. پێشتر من لەم نووسینەمدا چەندوچۆنی ئەو مەسەلەیەم بەو جۆرەی بووە باس کرد، دییارە مامۆستا زیوەر هەر ئەوەندەی لێبیستووە کەخۆی دەگێڕێتەوە. ئنجا دێتە سەر حەبسبوونی حەماغا لە بەغدا و ئەو سەخاوەتەی کە لە بەندیخانەدا بەدرێژایی حەبسبوونی کردوویەتی و دەڵێ: «هەروەک دیواخانی کۆیە لەحەبسخانەش دیواخانی لێڕاکێشا ژاندارمەری نۆبەتچی و مودیری حەبسخانە و زۆر لە حەبسی موستەحەق (دەبێ موستەحیق بێ» لەسەر نان و خوانی ئەو ئەژیان... کە لە حەبس نەجاتی بوو ئەو هەموو ئەشیا و حاجەت و لەوازیماتی مەتبەخەی تەرک کرد بۆ مەتبەخچی و مودیری حەبسخانە... هەر ئەو زەمانەش قیمەتی هەزار قڕان زیاتربوو».

پاش ئەمە باسی لێبووردوویی حەماغا دەکات بەرانبەر فەلاح و شوانکارە بەڵام «ئەگەر بەغەدر بەناحەق گاجووتێکیان ببردایە سەد قات ئینتیقامی ئەسەند». لەپاشاندا دەڵێ: «وەکوو بە ماڵ، بە نەقد، بە حەیوان ئینعامی بووە،

به موڵکیش بەخشندەیی کردووە. دێی مەلاهۆمەر لە ناحیەی مەرگە کە بەخشیویە بەشیلانەیی ئێستاش بەدەستیانەوەیە خۆیان تەسەڕڕوفی ئەکەن».

لە بارەی دێی مەلاهۆمەرەوە تێبینیم هەیە دەبێ دەری ببڕم:
مەلاهۆمەر سەربە ڕانیەیە، کەوتۆتە بەری بیتوێن، هۆزی شیلانەش لە بەری بیتوێن چەند دێیەکیان بەدەستەو و موڵکی خۆیان بوو هەتا هەمووی کەوتە ژێر ئاوی گۆمی دەسکردی دوکان. مەلاهۆمەر بەدەست کوێخا محەمەد دئەمینی ڕیش سپی و براگەورەی شیلانەکانەوە بوو، کەسیش لە میراتگری حەمائاغا تۆژینەوە و لێپرسینەوەی لەگەڵدا نەکرد. کاتێک لەپەنجاکاندا بەر لە شۆڕشی 1958 کە تەسویە گەییشتە ئەو هەرێمە کوێخا محەمەد ئەمین بێ ئەوەی کەس نیزاعی لەگەڵدا بکات هەر لە خۆوە دێیەکەی لەسەر حەماغا تەسویە و تاپۆ کرد. ئەو مرۆیە لەخۆوە پیاو بوو، دییارە بەو کردارەشی هەم حورمەتی پیاوەتی خۆی گرت و هەم وەفاکاریشی بەرانبەر یادی حەماغا بەجێهێنا سەدهەزار ڕەحمەت لە گۆڕی هەموو مرۆیەکی ڕاست و وەفادار. پێشتر لەسەرەتای دەرچوونی قانوونی تەسویە کەوا جارێ بیری چینپەروەری و دەنگ و سەدای خەباتی چینایەتی بەناو خەڵقدا بڵاو نەبووبۆوە فەلاحەکان خۆیان دانیان بە ملکایەتی خاوەن ملکدا دەهێنا، بەڵام تا تەسویە گەییشتە مەلاهۆمەر بیست ساڵێک بەسەر تەسویەدا تێپەڕی کردبوو حیزبە تازەکانیش بیری خەباتی چینایەتییان لە مێشکی فەلاحەدا جێگیر کردبوو مەلای ئەوتۆش هەبوون فەتوایان دەدا کە سوێندو تەلاق بۆ پاراستنی گیان و ماڵ گوناحی تێدا نییە. هەڵوەستی کوێخا محەممەد ئەمین لە ڕۆژێکدا بوو کە ئەگەر بە گەزوگرێی ئەو ڕۆژەی بپێوین دەبێتە دوژمنایەتی لەگەڵ خۆدا کردن جگە لەمە ئەو مرۆیە نەهات ملکەکە بۆ کاکەزیاد ساغ بکاتەوە بەناوی ئەوەوەی تەسویە بکات کە لەو دەمەدا کاکەزیاد دەسەڵاتداری میراتگرەکانی حەماغا بوو، کەسیش بیری لەوە نەدەکردەوە ببێتە بەرهەڵست بەرانبەر بەرژەوەندی ئەو، کەچی هات و ملکەکەی لەسەر حەماغای کۆچکردوو تەسویە کرد، واتە بەپێی شەرع و

ویژدان جولاّیەوە، حەیفە مەردایەتی شوێن بزر بکرێ هەر لەم تێبینییەی بزرنەکردنی مەردایەتییەوە دەڵێم، میراتگرانی حەماغاش لە بێدەسەلاّتییەوە مەلاهۆمەریان بۆ کوێخا محەمەد ئەمین واز لێنەهێنابوو، بەڵکوو حورمەتییان بۆ ئەو و بۆ شوونێکی کە لە حەماغاوە بەجێ مابوو هۆی خۆ لێ بێ ساحێب کردنیان بوو، لەوە هەر گەڕێ کە دڵنیابوون لەئەمانەتی کوێخا محەممەد ئەمین بایی ئەوەی کە دێیەکەی لێ داوا بکەنەوە سەرپێچییان لەگەڵدا ناکا...

دەنگوباسێکی لەحەماغا بەجێ مابێ کەمێکی زێدە کەمە لەچاو ئەوەی فۆتاوە، چونکە لەدەمی خۆیدا نەنووسراوەتەوە، دەماودەمیش ساڵە و ساڵ و پشتاوپشت لێی کەم دەبێتەوە یان گۆڕانی بەسەردا دێت، ژیانە دەوڵەمەندە بە سەروسەداکەی حەماغاش لەهەموو جۆرە بابەت ڕووداو و بەسەرهات و قسەی مەجلیسی و نوکتە و لەتیفە و خۆشی و ناخۆشی تێدابووە ئەگەر لە فۆتان ڕزگار بووبایە تەڕدەماغییەکی دیکەی بەخوێنەر و گوێگر دەبەخشی.

بەلاّم هەرچۆنێک بێ چاکترە لە هیچ، خۆو تاڵع هەندێک لەو باسانەی کە وەختی خۆی واحیداغا نووسیبوونیەوە و بزربوون لە بیری گوێگرانی ئەوسا مابوون و لەدەفتەری دووەمی کاک حاجی محەیدین نووسراونەوە. بەشێکی دیکەش لەو باسانە کاک مراد دیاری شاخە پیسکەیی خەفتیانی کۆ کردنەوەیانی کردووە و بەمن گەییشتووە. ناو ناوەیەکیش لەم لاو لەولاوە دەنگوبەنگێکی ئەو سەردەمە تێپەڕیوە خەبەرێکی حەماغامان پێ ڕادەگەیەنێ. لە تێکڕای ئەو سەرچاوانە هەرچی باسێکی شیاوی گوتنەوە بێ لێرەدا بۆ خوێنەری دەور دەکەمەوە.

بەر لە هەموو باس و خەبەرێک شتێک دەنووسمەوە لە دەفتەری دووەمی کاک حاجی محەیدین من لێرە بەپێشەوە هەرگیزاو هەرگیز نەمبیستبوو، بەپێی ئەو دەفتەرە گۆیا لە دەمی قائیممەقامەتی حەماغادا «1919- 1920» دەستەیەک لە نیشتمانپەروەرانی ئەوسای کۆیێ بەسەرۆکایەتی حاجی میرزا عەولاّ «خادم» ڕێکخراوێکی نهێنی پێکدەهێنن بۆ مەبەستی خزمەتێکی بتوانن

بە گەلەکەیان بگەیەنن، لە کۆبوونەوەدا ژمارەیان «27»کەس دەردەچێ. چەند نوێنەرێک بۆ لای حەمائاغا دەنێرن و لەحاڵ وباری خۆیانی دەگەیەنن حەمائاغاش دڵنەوازییان دەکات و ئافەرینیان لێدەکێشێ کە میللەت پیاوی وەکوو ئێوەی دەوێ گۆیا هەزار لیرەیان دەداتێ سەرفی بکەن لەو ڕێگەیەدا. ئەمەیە لە دەفتەرەکە نووسراوە، بەڵام لەبەر گوێم قسەیەکی دیکەش دزرینگێتەوە هەر دەڵێی لە تەلەفۆن یان لە وتووێژدا پێم گوتراوە: وەک دێتەوە یادم ئەو گرووپە پێیان گوتراوە بۆڵشەفیک، جا ئەگەر ئەمە وەهابێ دیارە ناوەکە لە شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە بۆ ئەوان زەنەی کردووە. ڕەنگە لەوەدا سەیرهاتنەوە لزوم نەبێ، چونکە لەو گەرماگەرمییەی دوای 1917 و شەڕی دووەم کۆمەڵە گەنجێک خەریک بن لە خۆوە خزمەتی میللەتیان بەئەستۆوە گرتبێ جێی خۆیەتی ناوی ئەوتۆییان بەدواوە بێ هەروەک یەکێک دوو قسەی بەجورئەتی کردبایە پێی دەگوترا فەرمەسۆن کە نە ئەو کەسە و نە خەڵقەکەش دەیانزانی وشەی فەرمەسۆن چ بنەڕەتێکی هەیە بەهەمەحاڵ ئەو 27 کەسە کەسیان بەرحەیات نەماوە پرسیارێکیان لە بارەی مەسەلەکەوە لێبکرێ، وەهاش پێدەچێ حیکایەتەکە بێ بنج نەبێ، چونکە وەک دەڵێن دووکەڵ بێئاگر نییە. بەداخەوە جگە لەوەندەی نووسیم هیچ شتێک لە کردەوەی ئەو گرووپەوە بەمن نەگەییشتووە ناشزانم چۆناوچۆنی پایدۆستیان لە کارەکەیان کردووە.

هەر لەو دەفتەرەدا باسی لە دایکبوونی کاکەزیاد نووسراوە بەو شێوەیەی کەمن پێشتر نووسیوەتم، بەڵام لە لایەن شوێنی لێ بەخێوبوونیەوە دەڵێ لە دێی شیواشوک «دەکەوێتە لای ڕۆژاوای مەیلەو قیبلەیی لە کۆیەوە» یارەیحانی خێزانی تایەرئاغا «ڕەنگە تایەراغای حاجی موستەفای مەلادەرویشی غەفووراغا بێ» بۆی دەبێ بەدایک و دایان، لە موناسەبەدا دەڵێم بەرلەوەی حەماغا کوڕی ببێ ڕۆژێکیان مام فەتاح ناوێکی خەڵقی دێی گومەشینی سەر بە خرابە کە ڕای گوێستبوو بۆ کۆیە و لەگەڵ غەفووریەکاندا دەژییا، ئا ئەو مام فەتاحە لەشی حەمائاغا دەشێلێ. خەبەری بۆ دەهێنن مام

فەتاح خوا کوڕێکی پێبەخشیت. دووای شوکرانەبژێری خەبەری دەدەنێ موژدە بێ کوڕێکی دیکەشت بوو جارێ بە تەواوی لە ئەلحەمدولیللا نابێتەوە خەبەری دێ پێوقدومی خێر بێ کوڕێکی سێیەمیشت بوو، ئەویش گورج کڵاو و جامەدانەی دادەماڵێت و دەڵێ بەقوربانو بم بیبەن لە زارکی پەستن با بەس بێ دواتر دەڵێ خوایە بە قوربانی کەرەمت بم حەماغا چەندی دەکا کوڕێکی نابێ ئەمنیش یەکێکم لێ زیادە بە سێیانم بەسەر دەکەیەوە، حەمائاغا پێی دەڵێتەوە قسەی وەها مەکە خوا ڕزقیان دەدات. باروبوویەکی باشی مام فەتاح دەکات و مەجلیسەکە بەباری خۆشیدا دەچێتەوە. لە کاکەزیادم بیست ئەو سێ کوڕە هەر سێیان گەورە بوون و پێشگەیشتن.

لەدەفتەرێکی کاک مراددا باسی ئەم بە دایان دانە هەیە شتێکیش لەو ڕەیحانەوە باس دەکات گۆیا خەڵقی گوندی «بەلەبان» و
لەهۆزی «سوورچی» بووە، زووتر شووی بە پیاوێک کردووە ناوی «مام ناخۆش»بووە، ئیتر یان بەتەڵاقدان یان بە شوومردن بێوەژن دەبێت و شوو بەو تاهیراغایە دەکات، بەهۆی دایانەتییەوە مەسرەفی ماڵی تاهیراغا و ئەرکی دیوەخانە و ڕاگرتنی باری دوو دێی شیواشۆکی گەورە و گچکەیان، شیواشۆکی سەرەوە و خوارەوە کە لە تەسەرڕوفی تاهیراغادا بوون، دەکەوێتە ئەستۆی حەمائاغا.

دەگەڕێمەوە بۆ دەفتەری دووەمی کاک حاجی.

حەمائاغا لە کەرکووک دەست بەسەر دەبێت لە دیوەخانەی «ناظم بگ- وابزانم لە بنەماڵەی نەفتچی و دەسەڵاتدارێکی بەناو بووە» مێوان دەبێت کوێخا یاخی برای کوێخا ڕەجەبی شوان بەسەردان دیاریەکی زۆر بۆ حەمائاغا دەبات و ئەویش لای نازم بەگ مێوان دەبێ بەرقییەیەک بە حەمائاغا دەدەن، لە کۆیەوە بۆی چووە، دەڵێ بایزپاشای مەنگوڕ 200 سەر مەڕی حەماغای گێڕاوەتەوە لە بڕی پووش و پاوانی کە مێگەلەکانی حەمائاغا تێیدا دەلەوەڕێن لە مەنگوڕایەتی. بایزپاشا دۆستی بووە و هەر لەویش مێوان

بووە تەنانەت کە نۆکەرانی بایزپاشا سالآنە لە کۆیێ پۆشتە دەکرێنەوە حەماغا بەناوی یەکمالّی مەسرەفیان دەکێشێ حەماغا دوای گەییشتنی بەرقییە بەعادەتی خۆی بێهەست دەم بە قەننەکەیەوە دەنێت و قومی لێدەدات وەک چ ڕووی نەدابێ، دەستەی خۆی پێی دەڵێن شکاتی حکوومەتی لێ بکا وەڵامیان ناداتەوە، کوێخا یاخی بەدەنگ دێت و دەڵێ بۆ وەڵامیان نادەیتەوە حەماغا بەو دەڵێتەوە، من بە بایزپاشام گوتووە تۆ دۆستمی چۆن لەسەر 200 سەر مەڕ خۆم بە درۆزن دەردەهێنم یاخوا نۆشی گیانی بێ. کوێخا یاخی دەڵێ دەک ماڵت بەقوڕ نەگیرێ بۆ خۆت و سەبرت من حەوت سەر بزنم گورگ خواردنی دوو حەفتە لەداخان نانم پێ نەخورا تۆش دەڵێی دووسەد سەر مەڕ عافییەتی بێ. زۆر نابا بایزپاشا کاغەزی بۆ دەنێرێ 40 مەڕم گێڕاوەتەوە ئەویش هەر بە ماڵی تۆی دەخۆم.

وابزانم خزمانی حەماغا کە هانیان داوە بۆ شکات لە نازم بەگیان ڕادیتوە نفوزی خۆی لای حکوومەتی کەرکووک بەکار بهێنێ بۆچوونەکەشیان لەجێی خۆیدا بووە.

لەم خەبەرەی واخەریکم بینووسم ئاکارێکی سینە فەڕاحی و باڵ قووڵی حەماغا دەردەکەوێ کە لەچەندین باسی دیکەی ئەوتۆیی دەردەکەوێتەوە. قەتارچییەکی پێی دەڵێ ئاغا مینەگەم تۆپیوە «مینەگ، وڵاغی سواربوون و کەلوپەل لێنان» حەماغاش پارەی دەداتێ وڵاغێکی دیکەی پێبکرێ دوای بەینێک حەماغا دەبینێ ئەو مینەگەی کە بەزار تۆپێنرابوو لەپێش وڵاغانەوە دەڕوات. بانگی قەتارچییەکەی دەکات و پێی دەڵێ، مینەگەکەت نەتۆپیوە، پارەکەی لێتوەرگرتم بۆ خۆت لێشت زوێر نابم ئەمما بە قەتارچی دیکە مەڵێ هەتا بەدخوو نەبن کابرا بە نیوە مردوویی خەجاڵەتەوە سوێندی بۆ دەخوا کە جارێکی دیکە نائەمینی ناکات.

هەڵوێستی حەمائاغا بەرانبەر بایزپاشاش باڵقووڵی تێدایە، بەڵام چاوپۆشیکردن لە قەتارچی بێدەسەڵات فەرقی هەیە لەگەڵ بووردوویی لە بایزپاشا لەگەڵ

ئەمەشدا دەبێ سرنج بدەینە ڕاستییەکی گەورە بەوەدا کە بووردن لە قەتارچی دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە بووردن لە بایزپاشا ناکێشێتەوە بۆ پێنەوێران و بەزەحمەت زانین بەڵکوو دەکێشێتەوە بۆ جەبدان و خاڵە بەخشکردنی دۆست، دەنا ئەگەر تێخوێندنەوەی پیاوەتی و دۆستایەتی لە بەیندا نەبێ خۆ دەیتوانی تۆڵە لە قەتارچی بسێنێتەوە.

خەبەرێکی دیکەی ئەوتۆییش لە نووسینی کاک حاجی و کاک مرادا هەیە لەگەڵ کەمێک جوداوازی لە نێوانیاندا، من دەفتەرەکەی کاک مرادی لێدەخوێنمەوە، چونکە بێگومان ئەو لە نزیکترەوە ئاگاداری باسەکەیە، هەرچی کاک حاجییە لەدەماودەمی خەڵقەوە پێی گەییشتووە. کاک مراد نەوەی کوێخا حەوێزی شاخەپیسکەیە مەسەلەکەش لەنێوان حەماغا و کوێخادایە.

کوێخا حەوێز خۆی گێڕابوویەوە، پیاوێکی کانی دەربەندی، فەقێ محەممەدی باپیر خزمی کوێخا حەوێز بووە ڕەوەیەک لە ڕەشەوەڵاغی حەماغای لا دەبێ لە ساڵی 1310ک کە دەکەوێتە بەرانبەر 1892ز دەچێتە حەج و لە سەفەرەکە نەهاتەوە دوای مردنی فەقێ محەممەد، کوێخا حەوێز ئەو ڕەوەگاڕانە بە گردی دەباتەوە بۆ کۆیێ بۆ حەماغا، لێی دەپرسێ حەوێز ئەو وڵاغانە چن؟ ئەویش مەسەلەی بۆ ڕوون دەکاتەوە... حەماغا پێی دەڵێتەوە حەوێز فەقێ نەماوە تۆ ماوی وڵاغەکان لای تۆ بن گاجووتەکانیان دابەستە بۆ جووت پێکردن گەنم جۆیەکەی بکە بە نان لەگەڵ ماستاو و دۆی مانگاکانیان مێوانی پێدامەزرێنەوە منیش خێرێکم دەگاتێ تۆیش پیاوەتیەکت چنگ دەکەوێ دەکەوێ، داخێکیشی دایێ بۆ ئەوەی هەر گوێرەکەیەک لەو ڕەوەیە پەیدا بوو پێی داخ بکرێ.

کوێخا وڵاغەکانی گێڕایەوە لای خۆی زۆر نابا گایەک لەو گاڕانە دەفرۆشێت و زینێک بۆ وڵاغەکەی بەو پارەیە دەکڕێت کڕیاری ئەو گایە مام ساڵحێکی کۆیێ دەبێ کە مەشوور بووە بە ساڵحەڕەش گایەکە لێدەخوڕێ لەبەر دەرگای حەمامی حەسەنەغا تووشی حەماغا دەبێ. حەماغا داخی گایەکە

دەناسیتەوە بە پرسیار کردن دەزانێ مامساڵح ئەو گایەی لە کوێخا حەوێز کڕیوە. حەماغا گایەکە لە مام ساڵح دەگێڕیتەوە و دەینێرێ بۆ حەساری وڵاغەکانی. بەدوا کوێخادا دەنێرێ پێی دەڵێ من وڵاغم دا بەتۆ بۆ پیاوەتی پێوە کردن نەک بۆ فرۆشتن و مامڵەت پێوە کردن کوێخا دەڵێ ئاغا ئەمساڵ گەنمم نەبوو گایەکەم بۆ پارەی گەنم کڕین، فرۆشت. دەڵێ کەواتە بڕۆوە ماڵی خۆت. بۆ بەیانی حەماغا هەشت بەر گەنم و گایەکە دەنێرێتەوە بۆ ماڵی کوێخا لە شاخەپیسکە پارەکەی مام ساڵحیش دەداتەوە کوێخاحەوێز لەو مەسەلەیەدا گوتبووی ئەمەیە درۆی لەگەڵ بکەی سوودی ڕاستی هەیە.

کوێخا حەوێز دەگێڕێتەوە دەڵێ حەماغا ڕۆژانی جومعە دوای نوێژکردن هەڵستان چوار لیرەی وردەی پارە بەسەر هەژاراندا دابەش دەکرد ڕۆژێکیان هەژارەکان هرووژمیان هێناو حەماغایان خست و پارەکەیان بە فڕان فڕان قۆستەوە حەماغایان لەبن هەژارەکان هەڵستاندەوە گوتی لێنەگەڕان بەڕێکی لێیان دارەبەش بکەم هەندێک پڕ و هەندێک قڕ. ئنجا بە نیازی سەردانی عەولاغای حەوێزی بەڕێ کەوت، خزمەکانی پێیان خۆش نەبوو ئەو سەردانە بکات گوتیان ئاغا، عەولاغا لەماڵ نییە گوتی دەچینە لای فەتاح «مەبەستی فەتاحاغا کوڕە گەورەی عەولائاغا بوو» گوتیان فەتاحاغا دەستی کورتە مەسینەی قاوەی هەڵگرتووە «فەتاحاغا زاوای حەماغا بوو». حەماغا چەند لیرەیەکی دەرهێنا بە خدری قاوەچی پیاوی خۆی گوت بیدە بە فەتاح دەچمە سەردانی، ئەمن شوێنی خۆم تێک نادەم.

هرووژمی فەقیران لەم حیکایەتەدا شتێکی دیکەی وەک ئەوم بە بیر دێنێتەوە. حاجی عەبدجاسم دەگێڕێتەوە دەڵێ ساڵی گرانی هاتمە کۆیێ خەبەرێکم پێبوو بۆ مەلا یەحیای تکریتی «باوکی فەریق طاهر یحیی»کە لە خانی مەحموودئاغا ژووری گرتبوو بۆ کاری مامڵەتی خۆی. دەڵێ وەها ڕێک کەوت بەچاوی خۆم دیتم لەدارەبەشکردنی نان و پێخۆر فەقیران دەوری حەماغایان داو لەپڕکێشی و هەڵپەی برسییەتی حەمائاغایان خست. دەست و پاوەندی ڕاستییان کردەوە و خەریک بوون لەفەقیرەکان ڕاخوڕن حەماغا

هەیدێی لێکردن و بەسەر خۆی نەهێنا و خواردن دارەبەش کرا وەک هیچ ڕووی نەدابێ.

ئەو هەیدێی دەمەی گرانی ساڵی 1917ز. حەماغا لە دەوری پیری و کۆتایی ژیبانیدا بوو، سێ ساڵی نەبرد بە ڕەحمەتی خوا شاد بوو. دەبێ زۆر لەخۆبووردوو بووبێ کە لەو تەمەنەی دووای 80 ساڵیدا ڕەفتاری لە سەراسۆییکردنی هەژاران ئەوە بووبێ کە حاجی عەبد لیّی دیتووە. گرانی لە زستانی 1917- 1918ز بوو حەماغاش لە هاوینی 1920 کۆچی دوایی کرد بەو پێیە دووساڵ و نیو دوای گرانیەکە ژیباوە.

کوێخاحەوێز دەڵێ، مام ڕەشید «ڕەشیدە کەڕ» بۆی گێڕامەوە، هاوینێکیان سەپانی خەرمانە جۆی حەماغا کە لە نزیک شارەوە بوو کێشەیان لە کایەکە دەکرد بۆ حەساری حەماغا بەبەر دەرگەی ماڵ و دیوەخانەی ئەمیناغای حاجی حەوێزیدا تێدەپەڕن، ئەمین ئاغا بە پرسیار دەزانێ کای جۆیە نەک گەنم، بە تەکلیف لێیان داوا دەکا هەندێک لەو کایە بۆ دابەستەکانی ماڵی خۆی بیەخن، سەپانەکان لەخۆوە نەیانوێرا کایەکە بیەخن و قسەیان بۆ حەماغا گێڕایەوە، حەماغا دەپرسێ چ خەرمانە جۆی لەو نزیکانە ماوە دەڵێن خەرمانێک ماوە جارێ گێرە نەکراوە، ئەویش پێیان دەڵێتەوە خێرا ئەو خەرمانە بکوتن بەکاو و دانەوە بیبەن لە حەساری ئەمیناغای ڕۆ بکەن.

ئەمیناغا لای خەڵق زۆر خۆشەویست و ڕێزلێگیراو بووە، تەنانەت گەورە پیاوانی کۆیێ قەبووڵیان بووە ئەمیناغا لە دیوەخانە بنوێت و هەڵیشی نەستێنن لە دەمی سەر لێدانی. وا مەشوورە کە تەقیەدین پاشا بەسەر غەفوورییەکاندا دەدات و لێیان دەکوژێت و دەگرێت ئەمیناغا بە هەڵبەست هەجوی پاشای کردووە لەسەر ئەو کارە ناڕەوایەی کە دژی غەفوورییانی کردووە تەنانەت ئەگەر ڕاست ئەگەر درۆ، حیکایەتێکیشی بە دوادا دەهێنن گۆیا مەفرەزەیەک بە نیازی دەردەست کردنی ئەو هەجوە بەسەر دیوەخانەی ئەمیناغا دادەدەن لەو دەمەدا باپیرم حاجی مەلاعەبدوڵڵا کە جارێ حەجی نەکردبوو کوڕە

پووری ئەميناغاش بوو لەوێ بووە و ئەو كاغەزەی كە هەجوەكەی لێ
نووسراوە بە دەستی خۆی پارچە پارچەی دەكات و دەيفۆتێنێ. ڕەنگە لە
شێوەی بەسەرەوەنان بێ كە هەندێک دەڵێن كاغەزەكەشی قووت داوە چونكە
نەكاغەز بەسەهلی قووت دەدرێ نەلزوميش هەيە بە قووتدانی. بەهەمەحاڵ
ئەمەش بەسەر زارانەوە دەگوترێ ياخود بابڵێم گوتراوە، چونكە كەم ماون
لەوانەی ئەو جۆرە خەبەرانەيان ئاگا لێيە.

كاک مراد دييار لە زاری خۆيەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ نەنكم لە ترسی دزو
ڕێگر و تالانكەر پارە و پوول و نوين و فەرش و لاكێش و ئەو جۆرە بابەتەی
نرخێكی هەيە لە ماڵی حەماغا دادەنێت. تومەز خاوەن حاڵ و بارێكی مناسب
بووە، ڕۆژێكيان بارێک گەنم و دوو هيزە ڕۆن و 30 داسی دروێنە بەرەو
كۆيێ دەبات بە نيازی دەمەزەن كردنەوەی داسەكان بۆ دروێنەی دەغڵ،
خزمێكی خۆی فەتاحی مام وسوو بە تفەنگەوە لەگەڵيدا دەبێ بۆ پارێزگاری
لە نزيک گردی چادر « لەسەر ڕێی نێوان كۆيە و هەولێرە گردێكی
ڕێكوپێک لە وێنەی چادرە» شوێنێک هەيە پێی دەڵێن « ژاڵە گوڵ سپی»
چەند ڕێگرێكی تفەنگ بەدەست ڕووتيان دەكەنەوە، بەر لەهەموو شتێک
تفەنگەكەی دەستی فەتاح... تەنها داسەكان بەجێ دەهێڵن، كاروانی ديكە
پێيان ڕادەگات و داسەكانيان بۆ هەڵدەگرن هەتا كۆيە، هەر ئەوانيش
مەسەلەكە باس دەكەن و دەگاتەوە حەماغا. بە توێژينەوە و پرسيار لەو
ئافرەتە دەزانێ چی و چەندی چووە. لە دوای مردنی حەماغا ئەو ئافرەتە
كەلوپەل و پارەيەكی لە ماڵی حەماغای دانابوو بۆ ماڵی خۆی دەهێنێتەوە كە
پارەكە دەژمێرێ دەبينی 250 ليرەی بە زيادەوە لەگەڵە، ئۆقرە ناگرێ
دەچێتەوە كۆيێ بۆ ساغكردنەوەی ئەو پارەيە تا بزانێ لە چييەوە بەگەڵ
پارەی ئەو كەوتووە. لە ماڵی حەماغا كەس نازانێ چۆناوچۆنی ئەو ليرانە
چوونەتە پاڵ ليرەی ئافرەتەكە، بەڵام مام ساڵحی مەشوور بە ساڵحەڕەش
شايەدی دەدا كە حەماغا لەبەر چاوی ئەو بەدەستی خۆی 250 ليرە دەخاتە
سەر ئەو پارەيە لە بری ڕۆن و تفەنگ و وڵاغ و ئەوەی كە ڕێگران ليیان

سەندبوو، چونکە خۆی بەرپرس زانیبوو لە زەرەرێکی بە خەڵق بگات لەوهەرێمەی کە دەسەڵاتی بەسەردا ڕادەگات.

کاک مراد لە زاری خوالێخۆشبووی سۆفی موستەفا دەگێڕێتەوە، جارێکیان حەماغا بۆ ماڵی جەمیلاغای حەوێزی بەڕێگاوە دەبێ دەبینێ حەفتا سەرێک لە مەڕ و بزن بەدەست قەسابانەوەیە، داخی ئاژەڵەکان دەناسێتەوە هی خۆیەتی. قەسابەکان دەڵێن لە فلان و فلانمان کڕیوە کە هەموو شوانکارەی دەبن، پێیان دەڵێ مەڕ و بزنەکە هی منن و بە پیاوەکانیدا بەرەو ماڵی خۆی دەیانگێڕێتەوە. قەسابەکان هانا دەبەنە بەر موستەفائاغای حەوێزی «دوو کوڕ و کچێکی شاعیری لێبەجێماوون، دلزار، شارەزا، فرشتە» ئەویش دەچێتە ماڵی حەماغا لای ئایشەخانی کیژی حاجی ئەسعەداغای حەوێزی بەخێرهاتنێکی باش و پلاو گۆشتێکی بەلەزەت پێشوازی لێدەکەن، کە حەماغا لە ماڵی جەمیلاغا دەگەڕێتەوە دەبینێ موستەفائاغا مێوانیەتی بەخێری دەهێنێ نانێکی بۆ حەماغایان هێنا ئەو ڕۆژە «دۆینە» بووە... تەکلیفی خواردن لە موستەفائاغا دەکا ئەویش ئیشی خۆی دیتبوو گوتبووی ئاغا کێ دۆینە دەخوا حەماغا پێی دەڵێ فەقێ موستەفا قسەی وەها مەکە خوا باشی داوە. خولاسە تەکلیفی ئاژەڵەکان بەوەدا دەکات کە دەڵێ ئەو مەڕ و بزنانە من کڕیومن ئەگەر نەم دەیتەوە زەرەرەکە بە من دەکەوێ، ئایشەخان لە ژێریی خۆیەوە دەڵێ کاکە موستەفا وازی لێ بێنە حەماغا دوژمنی حەوێزییانە، حەماغا بەدەنگ دێ دەڵێ کچێ عەیشێ من بۆچی دوژمنی حەوێزییانم تازە لە ماڵی فەقێ جەمیل دێمەوە فیتنەیی بۆچی دەکەی بڕۆن دەرکەی حەسار بکەنەوە با فەقێ موستەفا مەڕو بزنەکان بباتەوە عەیشێ فیتنەی لە چاودایە. تەواوی مەڕو بزنەکانی داوە موستەفاغا «دوای حەفتا ساڵێک لەو ڕووداوە دەڵێم شاڵڵا موستەفاغا «حق القدم»ێکی باشی لەو قەسابانە وەرگرتبێ ڕاستییەکەی بۆ ئەو حەڵاڵتر بوو لەوان».

میرزا محەممەد ئەمین لە زاری باوکی خۆی حاجی میرزا قادر دەگێڕێتەوە حەمەلارە ناوێک دێتە لای حەماغا بە شوانکارەیی بڕە حەیوانێکی

لێوەردەگرێ دوای بەینێک حەمەلارە دەمرێ چوار کوڕی لە دوا بەجێدەمێنێ سالْ و زەمان دەڕوا تاکوو حەماغا دوای پازدە سالْ حەبسبوون لەبەغدا دەگەڕێتەوە کە دەگاتە مالّی «شوان» دەوارێکی گەورە دەبینێ مەڕ و مالاّتێکی زۆری بە دەورەوە دەبێ حەماغاو هاوسەفەرەکانی بە مێوانەتی لادەدەنە ئەو مالّە دوای نان خواردنێکی هاکەزایی ئێوارە خاوەن مالْ لە پیاوێکی مێوانەکە دەپرسێ دەلّێ ئەو کابرایە کێیە پێی دەلّێ ئەوە حەماغایە... خولاسە مەعلووم دەبێ مەڕو مالّەکە میراتی کابرای کۆچکرددووی حەج کردوو بووە کە لە حەماغای وەرگرتووە بە شوانکارەیی واتە دۆ خۆری، کوڕەکان دەیانەوێ مەڕ و مالّەکە بدەنەوە بە حەماغا لێیان قەبووڵ ناکات و هەموویان پێدەبەخشێ.

لەم باسەدا دەستکارییەکی بچووکم کردووە کە بە مافی خۆمی دەزانم، گۆیا حەماغا بەخۆی و تاکە پیاوێکی بە پیادەیی لەو مالّە مێوان دەبن. ناشێ ئەمە ڕاست بێ، چونکە حەماغایەکی لە حەبساخانەی بەغدا لۆقتنە بۆ حەبسان قوت بکاتەوە ناچێتە عەقلّەوە دوای بەربوونی بەپێیان بیابانی چۆلی قورفە و دەشتە کاکی بە کاکیەکەی نێوان حەمرین و خورماتوو بکوتێیەوە. من حیکایەتەکەم لە خەلّقی دیکەش بیستووە بە نەختێک جودایی لەمەیان کە ئەوەندە نییە بیانکات بە دوو حیکایەت، بەلاّم نەک بە خۆو یەک پیاو و بێ ولاّغ بۆ کۆیێ گەڕابێتەوە...

کاک مراد لە زاری مام شێخ محەممەدی نادر لە تیرەی گەلاّلێ هۆزی جاف دەگێڕێتەوە کە ئەویش لە حاجی باپیری کانی دەربەندی باوکی مەلاقادری کانی دەربەندی نەقلْ دەکات گۆیا حەمەداغای سن لە لایەن حکوومەتی عوسمانلییەوە دەگیرێ مالْ و مندالّی هانا بۆ حەماغا دەبەن، ئەویش دەلّێ بڕۆنەوە بابتان بەر دەبێ. دووای دوو سالْ دیسان حەمەداغا گیڕایەوە مندالّەکانی سەرلەنوێ هانایان بۆ حەماغا هێنا... ئەم جارەیان پێی گوتن ڕۆلّەکانم، جاری پێشوو بابتان گرتووی دەستی عەبد بوو، ئەم جارە گرتووی دەستی خوایە بە عەبد بەرنادرێ لێرەدا نازانین چ هۆیەک حەماغای

گێڕاوە لە یاریدەدانی حەمەداغای سن، چونکە حیکایەتەکە لێی بێدەنگە. وەها پێدەچێ لە جاری دووەمدا حەمەداغا کەتنێکی وەهای کردبێ «حق الناس»ی تێدا پێشێل بووبێ کە ئیتر حەماغا ڕەوای نەدیتووە یارمەتی زوڵم بدات...

بەدووا ئەم ڕووداوەدا باسی نیزاعێکی نێوان حەماغا و حەمەداغای سەرۆکی بڵباسان «باوکی سواراغا» لەسەر زەویەکی بەینی دێی خدران حەماغا و سەرخمەی حەمەداغا دێتە پێشەوە. نیزاعەکە لای حکوومەتی کۆیێ دەدیترێ حەمەداغا کە دێتە کۆیێ بۆ موحاکەمەی ئەو کێشەیە بە عادەتی خۆی لە حەماغا مێوان دەبێ. حەماغا دەڵێ تۆ نیزاعت هەیە لەگەڵمدا دەبینم هەر لێم مێوانی حەمەداغا دەڵێ ئەگەر لە بیتوێنیشم دەرکەی هەر لە خۆت مێوان دەبم، ئەدی لە کێ مێوان بم، فەرموو جێیەکیم نیشان بدە و سەری ولاغم داماڵێنە هەتا برۆم حەماغا بێدەنگ دەبێ بۆ سبەینە خەبەر بە حکومەت دەدات کە نیزاعم لەگەڵ حەمەداغا نەما و زەویەکە هی ئەوە... وا دیارە لەو دەمەدا دەعوای ڕانیە لەبەر بێ حاکمیان یان بێ حکوومەتی هەر لە کۆیێ دیتراوە. لەسەردەمی عوسمانلییەکان جێگەی دوورە دەستی کەم ئاوەدانی وەکوو ڕانیە گەلێک جار بێ حکوومەت دەبوو بگرە من خۆم دیتوومە بارەها و جارەها حاکمی کۆیێ سەرپەرشتی دەعواکانی ڕانیەی کردووە یان دکتۆری کۆیە ڕاپۆری لەسەر هۆی مردنی کوژرا و مردووی ڕانیە دەرکردووە، چونکە دکتۆری ڕانیە وەکوو دڵۆپەی زستان ناو ناوە بوو.

لە مام حەمەدی برایم خەڵقی دێی «بانەمورد» لە زاری باوکی گێڕاوەتەوە گۆیا حەماغا دوای گەڕانەوەی لە بەندیخانەی بەغدا جارێکی دیکەش لە حکوومەتی عوسمانلی یاغی دەبێ و بە کۆمەڵێک چەکدارەوە لە چیای دێدەوان کە لای ڕۆژاوای سەر بە قوشتەپەی هەولێرە لای ڕۆژهەلاتیشی سەر بە قەزای کۆیەیە خۆی قایم دەکات. لە ڕۆژاوای بانەمورد کانیاوێک هەیە ئاوی لێدەخۆنەوە ئێستاش « واتە ئەو دەمەی کە حیکایەتەکەی تێدا گێڕاوەتەوە» پێی دەڵێن ئاوی حەماغا، کانی حەماغا. کوێخا فەتاحی کوڕی

دەروێشی کوڕی بابیل کە قسەڕەوای دێهاتی هەرێمی بانەمورد و نیڵەگین بووە زۆر خزمەتی حەماغا و نیمچە لەشکرەکەی کردووە بەنان و پێخۆر و بەگۆشتی کاوڕ و گیسک و چییەکی لە دەستی هاتبێ، بەدکارانی دێی خۆی خەبەری حکوومەتی لێدەدەن کە یارمەتی یاخییەکان دەدات حکوومەتیش مەفرەزەیەکی گەورەی دەنێرێتەوە سەر و دەیگرن و بە گوریس لە تەنگەکێشی ئێسترێکی دەبەستنەوە هەتا کۆیێ بەپێی ئێستر مەیلەو نیوە غار دەیبەن. فەتاح تا ئەوەی کە لە دەوری ئینگلیزەکان مەلا ئەحمەداغای ئامۆزای حەماغا بوو بە مدیر ناحیەی تەقتەق لە مەڕانە و جووتانە نیوەی حەقی حکوومەتیان لە منداڵی فەتاح وەردەگرت دوای حەماغاش هەتا کاکەزیاد ماڵی گوێستەوە بۆ بەغدا ئەو ئەولادانەی فەتاح هاتوچۆیان کردووە حەماغا خۆی ئامۆژگاری کەس و کاری خۆی کردووە کەدوای مردنی ئەو ئاگاداری حاڵ و باری منداڵی فەتاح ببن.

کاک مراد لەو مارف سەفەرەی کە پێشتر لەم نووسینەدا ناوی هات دوو حەیران یاد دەکاتەوە، ئەمە دەقەکانیانە:

حەیرانی یەکەم:

حەیران وەرە دەشتی بیتوێنی لەمن بە ڕووبار و شەتە
گەردەنت لە بۆمن دەبوو بە شوشەی گوڵاو ڕوومەتت شەکراو و شەربەتە
کچێ وەرە بتبەمە ماڵی حەماغای کۆیێ بۆمان بکاتەوە مەسڵەتە

حەیرانی دووەم:

حەیران وەرە لە بۆت بەکوێ هەڵبڵێم لە پەرێزە جۆیێ
مەمکە لە بۆمن دەبوونە نارنج یەکیشی دەبوونە لیمۆیێ
کچێ وەرە دەستت بگرم بتبەمە ماڵی حەماغای کۆیێ

ئەم حەیرانانە شتێکم بە بیردا دەهێنێتەوە لەسەروبەری گەمەوگەپی منداڵیم کە پێوەندی بە ناوی حەماغاوە هەیە. لە نێوان منداڵاندا پەشیمان بوونەوە و قسەی خۆخواردنەوە و حەوجەی منداڵی دیکە بوونەوە زۆر ناخۆشە و پێدەشکێتەوە، ئنجا ناچاری فێری فێڵێکی کردبوون خۆیانیان پێدەپەڕاندەوە لە عەیبەی ئەوتۆیی. کە منداڵێک تووشی پەشیمانی دەبوو بەر لەوەی سەرشکێنی بکەن دەیگوت «ئیشالەکە و پالەکە چوومە ماڵی حەماغا شەکراوم خواردەوە و هاتمەوە». هەرچەند نازانم ئەو قسە تێکهەڵکێشە چۆناوچۆنی داتاشراوە بەڵام، دیارە «ئیشالەکە» لە «ان شاء الله» مەشوورەکەوە هاتووە، وابزانم «پالەکە»ش خزمایەتی هەبێ لەگەڵ «پاک بوونەوە» دا. دەمێنێتەوە شەکراوەکەی ماڵی حەماغا. بەهەر لایەکیدا بیخەیتەوە هەر ئەوەی لێدەفامرێتەوە کە شەکراو خواردنەوە لە ماڵی حەماغا خاڵە بەخشکردن و پەنادانی مەسڵەتی پێوە بێ. وەک دییارە مەتەڵەکە منداڵان سازیان داوە. بەداخەوە کۆمەڵێک زاراوەی گەمەوگەپی منداڵان کە دەچۆوە بۆ سەرچاوەی سافیلکەی ساوایی گەلێکیش زەکاوەتی تێدا بوو لە بیران چۆوە و وجاغی کوێر بۆوە. منداڵی ئەم سەردەمە پتر ئاشنای زاراوەکانی فووتبۆڵە هەتا زاراوەی «خواجە ڕۆیی- خوازەڵێی پژدەر- و زرینگ زرینگ تاوە لەوێ بی حسێبی ناکەم و سەرشار و قەلەمرداری گەورە و گچکەی تۆپانێ و یاری "چکەندەرە- کەس نەیزانی واتای چییە» و گەلێک ناو و زاراوەی دیکەی جۆرەها گەمەوگەیی چوار فەسڵەی منداڵ و جحێڵان» کەهەر فەسڵە بەپیی گەرمی و ساردی و تەڕی ئیشکی جۆرە یارییەکی لێدەوەشایەوە. هەندێک لەناو و زاراوەی ئەو گەمانە لە کۆنەوە هاتووە هەرچی شەکراوەکەی ماڵی حەماغایە هی سەردەمی حەماغا خۆیەتی. لە دەوروبەری کۆیێ پەندێکیش هەیە دەڵێ «بەختی خۆی و نانی حاجی مەلا عەوڵا» کە دەکاتەوە باپیرم. لە گرانی گەورە ئەویش فەقیرێکی زۆری نان داوە و هەندێکیان بەو نانە لە مردن ڕزگار بوون. گرانی گەورە لە بەرەو کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا خەڵقی پێ هەڵوەریوە.

مراد له ڕەحمانی کوێخا حەوێز نەقڵ دەکا دەڵێ «قوتب – قطب» ناوێک مەلا بووە عەقڵی تێکچووە هاتۆتە کۆیێ لە دیوەخانی حەماغا پاڵی لێداوەتەوە کەس لێی بەدەنگ نەهاتووە، چشی ویستبێ وەهای کردووە. جارێکیان نانی نیوەڕۆ بۆ دیوەخانە دەهێنن. قوتب بێپرس دەچێتە سەر سینییەکەی لای حەماغا دەست دەکا بە خواردن. نۆکەرێک پێی دەڵێ، قوتب ئێرانە جێی تۆ نییە. حەماغا پێی گوتەوە، لێی گەڕێ لێم بوویتە ئەحمەڕەشی قاوەچی خۆت لە خەڵق تووڕە دەکەی. قوتب نانەکەی لەگەڵ حەماغادا
خوارد. «ئەحمەڕەش هەناری، قاوەچی ئەميناغا بووە، لای حەوێزیەکان لەپێش بووە بە چاوی قاوەچییەتی سەیری نەکراوە».

مەلا ئەحمەد ناوێک پیاوی حەماغا و تفەنگ هەڵگری بووە و خۆشیویستووە، لەقساندا خەڵقەکە دەڵێ مەلا ئەحمەد گوزەرانی باش نییە و دەستی کورتە حەماغا گوێ بیست دەبێ و دەڵێ ئەگەر ئەو دەستی کورت بێ دییارە من نەماووم. با فڵانە ئاش بۆ ئەو بێ و داهاتەکەی بخوا مەلا حاڵ و باری قنج دەبێتەوە دوای چەند ساڵێک بێپرسی حەماغا ئاشەکە دەفرۆشێ بۆ نێوان تێکدان و فەسادی، هەندێک بە حەماغا دەڵێن مەلا ئەحمەد بێ ڕەزای خۆت ئاشاکەتی فرۆشت حەماغا ئەوەندە دەڵێ، ئەگەر بەمنی فرۆشتایە پترم پارە پێدەدا...

کوێخاحەوێز دەگێڕێتەوە دەڵێ، لە ماڵی حەماغاوە ڕۆژی چوار تەنەکە گەنمیان دەبرد لە «ئاشیلکە» ی حەسەناغا، کە لەناو شار نرابۆوە، دەیانکرد بە ردو دەبوو بەرەیەکیان چێشتی شلەی «برنج و ماش» بۆ دیوەخانە لێنرابوو بەڵام نانێکی زۆری لەگەڵدا بوو. حەماغا دەڵێ، حەوێز ئەوە چییە کەم زۆر دەکا شل توند دەکا گەرم سارد دەکا. کوێخاحەوێز لە وەڵامدا دەڵێ ئاغا ئەوە چێشتی شلە ئەگەر نانی تێگوشی توندی دەکا، ئەگەر کەم بێ زۆری دەکا ئەگەر گەرم بێ ساردی دەکا.

مراد عەولای گوڵەی دێی «تەکووڵ» لە تیرەی «بۆربۆری» بوو پیاوێکی کامڵ بوو گێرایەوە کە لە ساڵی گرانی خەڵق لە برسان دەمرد، وەک ئاژەڵ لە دەشت و دەر گیا و گوڵیان دەخوارد. دیوەخانی حەماغا هەمیشە قەرەباڵغ بوو نانێکی زۆری لێدەخورا بەتایبەتی خەڵقی دیوی بیتوێن ڕوویان لێدەنا.
ڕۆژێکیان لەگەڵ پیاوێکی بڵباس کەوتینە سەر سینییەک. کابرای بڵباس لەمن زووتر بەشەنانی خۆی تەواو کرد و دەستی دایە کەوچک و چێشتی شلی پێ فڕ دەکرد. کە منیش لە نانەکەم بوومەوە بەکابرام گوت کەوچکەکەم پێبدە منیش هەندێکی لێهەڵقوڕێنم کابرا گوتی تولەباب، گێچەڵان دەکەی، من بۆ خۆ دەستم داوەتە کەچکی کوو وێت دەدەم، بەدەستی وەخۆ پێم گوتەوە پیاوی چاک بە لێ گەڕێ سێ چوار کەوچکان فڕ کەم گوێی نەدامێ، منیش بەهەر دوو دەستم مستم لە چێشتەکە پڕ کرد بنی لە گەنەکەم بەدەرخست جاری دووەم دەستم بردەوە کابرای بڵباس گوتی ها کاکە کەچکێت وێدەم...

کوێخاحەوێز باسێکی شەڕی خدران دەگێڕێتەوە. خدران عومدە دێی ماڵی چنارانە کە لە پاش دامەزرانی حکوومەتی عێراق بوو بە ناحیە و مەرکەزی ناحیەش لە خدران بوو هەتا ڕێگەی ئۆتۆموبیل لە سلێمانییەوە بۆ ڕانیە و پژدەر بە ڕۆستەمدا کرایەوە ئیتر مەرکەز گوێزرایەوە بۆ میرازا ڕۆستەم.

لەدیوی بیتوێن دێی خدران بە ئاو و بەراو و زەوی و پاوانی فراوانیەوە بنگەی دەسەلاتی غەفوورییەکان بوو، وەکیلی حەماغا هەمیشە لەو دێیە دانیشتووە.
شەڕی خدران تا ئەو ساڵانەی دواییش بەسەر زارانەوە باسی دەهات و ناوناوە نوکتەشی تێدا دەگێڕدرایەوە وەک کە دەیانگوت ئاغایەکی شارنشینی غەفووری کە زۆر ئاشنای شەڕ و لێقەومان نەبووە لە گەرمەی تەنگانەدا وەها شڵەژاوە پاش و پێشی ولاغی لێ تێکچووە و لغاوی بەبن کلکی ولاغەکەوە ناوە، لغاو جێی نابێتەوە و کلکی ولاغیش بۆ کابرا ملزەم نابێ ئیتر دەستێکی بە کلکی ولاغەوە و دەستی دیکەی بە لغاوەوە لەسەر سمتی ولاغەکە کوتەکوتیەتی ئەویش بێلزوم لەوشێوایەدا بەولاغەکە دەڵێ، ئەتوو بژت وەها

درێژ بووە ئەدی ئەو نێوچاوانەت لەبۆ وەها پان بووە، ڕەنگە نوکتەکە هەڵبەستراو بێ بەڵام تا ڕادەیەک باری ئەو شەڕە ڕوون دەکاتەوە.

کوێخا حەوێزی شاخەپیسکە، کە خۆی لەو شەڕەدا بەشداری کردووە، لەو دەفتەرەی کاک مراد بۆمان باس دەکات و دەڵێت سەید ئەحمەدی بابە ڕەسووڵ کە لە ساداتی سلێمانی بوو لە سەردەمی عوسمانلییەکاندا فەرمانی حکومەتی بۆ دەرچوو بە قائیممەقامەتی ڕانیە حەماغا «بگرە تێکڕای غەفوورییان» بەرژەوەندیان لەوەدا نەدیت دەسەڵاتدارێکی وەکوو سەید ئەحمەدی بابە ڕەسووڵ لە ڕانیە ببێتە قائیممەقام و لەنگەری دەسەڵات بەبارێکدا بچێت کەوا ڕەنگە بە زەرەری خۆیان تەواو بێ حەماغا وەڵامی نارد بۆ سەید ئەحمەد کە واز لەو نیازە بهێنێ و ڕێی ڕانیە نەگرێتەبەر سەید ئەحمەد بەوەدا رژدتر بوو لەسەر مەبەسەکەی و بڕیاریدا بە شەڕیش بێت هەر بچێت بۆ ڕانیە. حەماغا لەشکرێکی دوو هەزار کەسی هەڕەمە بۆ خدران دەنێرێ بەپێی قسەی کوێخا حەوێز لەشکرەکە لە ئاکۆ، بڵباس، خۆشناو، خەڵقی وڵاتی کۆیێ پێکهاتبوو «ڕەنگە شیلانەشی لەگەڵدا بووبێ»ئەو خەڵقە لە بەرزاییەکانی دەوری خدران قایمەکاری دەکەن و ئامادەی شەڕ دەبن. سەید ئەحمەدیش لەشکرێکی لە میراودەلی و جافە ڕەشکە و هەمەوەند و شێخ بزێنی و وردە هۆزی دەوری سلێمانی ڕاپێچەک دەدا و لە دەراوی «دوکان» بۆ بەری قەزای ڕانیە دەپەڕێتەوە و ڕوو لە بیتوێن دەکات. ئەوسا دەشتی بیتوێن کێڵگەی کەم بوو بە زۆری جۆگەکانی دەکران بەمەرزەوە لەلایەن خاوەن دەسەڵاتەکانەوە لەو قاڵبە مەرەزانە بەو لاوە هەرچی دەشت بوو بریتی بوو لە پووشەڵانی زەمەند. تاقمی سەید ئەحمەد بیتوێن ئاگردەدەن سووتەن دەگاتە کناری دێیەکانی بناری کۆسرەت وەکوو مێوژە و خدران کە لەشکری حەماغای لێبوو. تەقە دەست پێدەکات و دەبێتە تێک هەڵدایی. کوێخا حەوێز دەڵێ لەشکری حەماغا لەو شوێنە سەختانە خۆیان توند کردبوو تفاقیش وەها ڕێکخرابوو لە سەنگەرەکاندا چیخی گەورەیان ڕاخستبوو بەمەنجەڵ پڵاوی لەسەر ڕۆدەکرا بۆ لەشکر هەروەها بە

ئێستریش کوندە ئاو بۆ سەنگەرەکان دەچوو بەبار نان دارەبەش دەکرا. وەستای چەخماساز بەسەر سەنگەرەکاندا دەگەرا تا ئەگەر یەکێک فیشەکی پێ نەمابێ بۆی داگرنەوە، تەنانەت نالبەند دەگەرا ولاغی خواسی نال دەکردەوە، کوێخا دەڵێ لەشکر لەو سەنگەرە سەختانەدا کەوتنە جووڵەجووڵ و بێ ئۆقرەیی وردە وردە هەر تاقمە سەنگەری بەجێدەهێشت و بەرەو ماڵی خۆی تێی دەقووچاند ئێمەی چەند کەسێکی ولاتی کۆیێ سەنگەرمان چۆل کردو بەرەو کۆیێ بووینەوە گوێم لێبوو یەکێک لە دوامانەوە بانگ دەکا دەڵێ، کوێخا ڕاوەستە هەڵمەیێ هیچ نییە کە ئاورِم دایەوە دیتم سوارێکی کۆییە ولاغی داوەتە بەر ئاوزینگ و شەدەی لەملان ئالاوە و باڵی بە ولاغەکەی گرتووە و بەغار لە هەلاتندایە و دەڵێ کوێخا هیچ نییە مەترسە. کوێخاحەوێز پێی دەڵێتەوە بەخوا سەهوویت دەتەوێ پێشم بکەویتەوە.

وەک دییارە شەڕەکە بەشکستی لایەنی غەفووری کۆتایی هاتووە، بەلام لە بەختی حەماغا حکوومەت سەید ئەحمەدی وەرنەگرت بە قائیممەقام. بەلای منەوە هۆی پاشگەز بوونەوەی حکوومەت لە هەوەڵ بڕیاری خۆی کە سەید ئەحمەدی کردە قائیممەقام لەچەند لایەنێکەوە بووە. یەکەم ئەوەیە «وەک کوێخا حەوێزیش دەڵێ» سەید ئەحمەد بێپرسی حکوومەتی ئەو لەشکرەی کۆکردەوە دووەم ئەوەیە کەمانەوەی سەید ئەحمەد بە قائیممەقام دووای ئەو هەرایە زلە داخوازی دەکا هەمیشە قەزای ڕانیە بە هێزێکی هەڕەمەی چەند عەشیرەتی لەگەڵ سەید ئەحمەد سەنگەرنشین بن بەرانبەر بیتوین و کۆیێ ئەوساش شتێک لە نێواندا نامێنێ پێی بگوترێ حکوومەت مەگەر هێزێکی لەهەر دوو لا گەورەتر لە موسڵ و کەرکووکەوە بێت و شکۆی حکوومەت بسەپێنێتەوە. هۆی سێیەم ئەوەیە ڕانیە و پژدەر هەرێمی سەر سنووری ئێرانن و کەس نازانێ ئەگەر سەید ئەحمەد بەو شێوەیەی بێ حکوومەتی لەو ناوچەیەدا چەسپا دامودەزگا و دەستەندا و سیاسەتی ڕوو لە چی و لە کوێ دەکات بۆیە بەهەمەحاڵ مانەوەی حەماغا بەدەسەلاتی جارانیەوە لە شوێنێکی وەکوو کۆیەی شارستان و ناوچەی

حکوومەتدا کەمتر مەترسی لێدەکرێ تا ئەوەی سەید ئەحمەدێکی هەندەران بەگیان و هەستی سەرکەوتوویی‌یەوە لە ڕانیەی دووره دەست قوت بێتەوە، ئەمانەم بەبیردا دێن وەک سۆسە کردن لە نیازی حکوومەتی ئەوسای عوسمانلی خۆ لە دڵی ئەویشدا نیم بزانم چ جۆره لێکدانەوەی دیکەشی کردووە...

شکستی غەفوورییان لەو شەڕەدا دەچێتەوە بۆ چەند هۆیەک یەکیان «بێسەرۆکایەتی». وەکیلی هەره لەپێشی حەماغا برازا و زاوای خۆی قادراغای سمایلاغا بووە کە سەرپەرشتی هەراکەی کردوە. قادراغا بەشەخسی خۆی ترسنۆک نەبوە، بەڵام لەدەستی نەهاتووە ڕابەرایەتی بڵباس و ئاکۆ و خۆشناو بکات. حەماغا خۆی لەو شەڕە بەشدار نەبوە ڕەنگە ئەگەر لە خدران بووایە ئەو شەڕکەرانە بەو ئاسانییە بڵاوەیان لێ نەکردبایە کاکەزیاد گوتی قادراغا دوای شەڕەکە دەچێتە لای میری خۆشناوان لە بێتواتە و بەینێک لای دەمێنێتەوە وابزانم شەرم بەخۆداهاتنەوە ئەو ڕێگایەی پێگرتۆتە بەر. پرسیارێک لێرەدا هەڵدەستێ، بۆچی لەشکری سەید ئەحمەد کە هەڕەمەش بوو توانی سەربکەوێ؟ وەڵامی ئەم پرسیاره خۆی دەبێتە هۆی دووەمی شکانی غەفوورییان. لەشکری سەید ئەحمەد وەکوو لەشکرەکەی «طارق کوڕی زیاد» ڕێگای هەڵاتنی نەبوو، چونکە لە دوورەوە هاتبوون مەگەر بەشکستی شەڕ دووڕاندن دەنا دەبوو هەر ڕژد بن لەسەر بردنەوەی شەڕەکە هەرچی لەشکری حەماغا بوو لە ماڵ و حاڵی خۆیان نزیک بوون سەلامەتی بۆ ئەوان لە هەڵاتندا بوو شکستیشیان بە زەرەری خۆیان حیساب نەدەکرد. ڕەنگە تا ڕادەیەک بڵباسەکان لە سەرکەوتنی سەید ئەحمەد ترسیان هەبووبێ، بەڵام لێرەدا ناتوانم بەبەر تەحلیلی هەڵوێستی ئەوانەوە هەڵنیشم و بیرکاری تێدا بکەم. بەهەمە حاڵ دڵنیام لەوەدا ئەگەر شەڕ دەوامی کردبایە بڵباسەکان لە هۆزەکانی دیکە پتر چالاک دەبوون. ڕەنگە ڕقێکی کۆنی هەمەوەند و شێخ بزێنیش دەورێکی هەبووبێ لەو شەڕەدا.

هۆی سێیەم لەشکستی غەفووریيان دەچێتەوە بۆ کەیف و سەیران کە بەو پڵاولۆغانەدا دەردەکەوێ، مەردی جەنگی چەند نوردو و نان و چەند لوێچ مێووژ لە تێشوو دەنێت نەک مەشکی لەسەر پڵاو و گوشت دادەنێ. خەرمانی پڵاو بەسەر چیغەوە بێ و ئاو بە کوندە بەدوا شەڕەکەردا بگەڕێ و ناڵبەند و چەخماخسار دەستەونەزەر ڕاوەستێ هەر دەیەوێ دوو چاوەش دەهۆڵ و زوڕنا بکوتن بۆ هەڵپەڕکێ.

ئەم شکستەی غەفووریيان بە بیری من لە 1946 یان 1947 ڕوویدایەوە بەڵام ئەمجارەیان مەلاحەوێزاغای حەساناغا تێیدا بەرپرس بوو کاکەزیاد لە بنەڕەتدا تێدا نەبوو: هەرچەند لە دواییدا ئەرک و مەسرەف یەخەی ئەویشی گرت. هەرای 46،47 ناوی شەڕی چنارانی پێوەنرا بەری هێرشبەر بە ئەساس پژدەری بوون، بەڵام ئاکۆش بەسەرۆکایەتی عەباسی مامەنداغا تێدا بەشدار بوون جگە لە کۆمەڵی تیرە و خزمی نزیک و دووری ئەم و ئەو. ئەمجارەش بێئەوەی شەڕ گەرم بێ بەرەی مەلاحەوێزاغا کە لەشکرێکی هەمە جۆرەی بێسەروبەر بوو وورەی بەرداو ڕووی لە بڵاو بوونەوە کرد، بەڵام جوداوازییەکی یەکجار گەورە هەبوو لە نێوان ئاکامی شەڕی خدرانی سەردەمی حەماغا هەرچەند شەڕەکەی دۆڕاند، بەڵام لە مەنعکردنی سەید ئەحمەد لە قائیممەقامەتی ڕانیە بەزیادەوە تێی هێنایەوە تا ئەوەی دەشێ بگوترێ لە ئاکامدا سەرکەوتوو بوو سەید ئەحمەد شەڕی بردەوە بەڵام ئامانجی دۆڕاند. کوێخا حەوێزیش لە قسەکانی خۆیدا دەڵێ حەمائاغا هەر مەسرەفی لە کیس چوو کە بەلای ئەوەوە تەئسیرێکی نەبوو تەنانەت دەڵێ حکوومەتی عوسمانلی ویستی خەسارەی حەماغا بداتەوە حەماغا گوتبووی هیچ خەسارەم لێ نەکەوتووە. بەپێی قسەی کوێخا حەوێز کە بەڕاستی نیشانی پێکاوە حەماغا لەپاشگەزبوونەوەی سەید ئەحمەد و گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی بەدەستی بەتاڵەوە هەموو خەسارە و مەسرەفی شەڕی بە سوودێکی زۆر گەورە حیساب دەکرد خۆ ئەوەی دەیزانین لەبارەی سەخاوەتی حەماغاوە شتێکە پێمان دەسەلمێنێ کە ماڵی دنیای بەلاوە هیچ نەبوە لەئاست

ڕەوتی دنیایی و سەبەرزی و قسە چوونە سەرو شتی ئەوتۆیی. شەڕی چناران وەها نەبوو بەپێچەوانەوە شکستێکی بێ پێچوپەناو بێ ئاکام بوو. وێنەیەکی تێشکانی ئەو ساڵە کە بەچاوی خۆم دیتم «وورە بەردان»ی شەڕکەرانی بەرەی مەلاحەوێزاغا بوو.

لەسەر تەکلیفی کاکەزیاد بۆ ناوبژیکردن لەخزمەت مامە نوورەددین و شێخ سەدری شێخ کەریمی بەرزەنجی پاش عەسرێکیان کە خەبەری شەڕەکە پەیتاپەیتا بە ئەنواعی شکڵ دەگەییشتە کۆیێ بەرەو دیوی ڕانیە بەڕێ کەوتین بەر لە بزووتنەوەمان من لەگەڵ تاقمی لەشکری ڕانیە تەلەفۆنم کرد کە ئەگەر ڕێمان نەشکێنن بەتەماین بچین بۆلایان بەگەرمی بەخێرهاتنیان لێکردین. ئێمە کە لە کۆیێ دەرچووین غەفوورییەکان تفەنگی برنەویان دەکڕی بە 200 دینار و بۆ خدرانیان دەهەنارد کەچی لەماوەی سەعات و نیوێکدا تا گەییشتینە کانی کەندی چنارۆک پتر لە سی تفەنگچی تووش هاتین بەرەو کۆیێ ڕایان دەکردەوە وەهاش بەپەلە بوون پێیان ناخۆش بوو بۆ پرسیار ڕایان بگرین... شەو لە کانی کەند بووین سبەینی کە دوای ڕۆژهەڵات بەڕێ کەوتین لەو هەموو ڕێ و بانە 5 - 6 سەعاتییە تەنها یەک پیرەژنی بلْباسمان دیت لە بیتوێن کوردی دەڵێ ئەو خەڵقە لەترەی بەردا بوو. کە لە کۆیێ دەرچووین گەییشتینە بناری چیای چنارۆک بەدیوی کۆیەدا تووشی هەشت سواری تفەنگچی بوغە بوغەی کۆیێ و غەفوورییان بووین هەموویان بە بەهانەی گەیاندنەوەی ئافرەتێک بۆ کۆیێ لەشەڕەکە هەڵاتبوون بەزەحمەتیش بۆمان ڕاوەستان دوو قسەیان لەگەڵدا بکەین چەندین هەڵاتوومان دیتن ترسنۆکی خۆیان بەوەدا دەشاردەوە کە بە ئێمەیان دەگوت لە ڕێی خوا بۆ ئەو ئاگرە مەڕۆن هەر نەبێ ئالایەکی سپی هەڵکەن ئێمەش هیچ ترسمان نەبوو دۆستانە بەڕێوە بووین.

ئەمجارەیان شکستی مەلاحەوێزاغا هەڵنەبەسترایەوە و گەشەی دوای شکستی خدرانی بە دوادا نەهاتەوە. بەهەمەحاڵ جگە لە شەخسییەتی حەماغا و لە

کشانەوەی سەید ئەحمەدی بابەڕەسووڵ، ڕۆژگاریش لەماوەی چلساڵێکدا وەها گۆڕابوو نەشێ قیاسی هەڵکەوتی کۆن لە هی نوێ بکرێ.

مراد بۆ وەدەست هێنانی ئەخباری حەماغا چۆتە لای
موستەفائاغای «مصطفی اغای» حەوێزی ئەویش لەوەڵامدا پێی گوتووە بە دوو کڵاوی بابردوو کەوتووی. مراد زۆر ژێرانە پێی گوتۆتەوە، ئەگەر کڵاو با نەیبردبێ و بەسەری خاوەنیەوە بێ بۆچی بە دووی بکەوم، ئنجا موستەفائاغا پێی دەڵێ، حەوێزی پێش غەفوورییان هاتوونە کۆیێ «بالی بەگ»ێک هەبوو کوڕێکی بوو ناوی ناوە «عویض» «دییارە مصطفی ئاغا ویستوویەتی بڵێ حەوێزی لەو «عویض»ەوە لەقەبیان بۆ ماوەتەوە». کە غەفووری هاتە کۆیێ و چەسپان هەراو ناخۆشی لەنێواندا پەیدابوو. چەندێکی دەوری حکوومەت و قەڵەم کاری و نووسین بووایە باوی حەوێزیان دەبوو ئەگەر دەوری چەک و سوارێنی و تەقوتۆق و عەشایەری بووایە باوی غەفوورییان دەبوو هەر لایەکی سەرکەوتووبایە دیوەخانی بەلایەکەی دیکە دادەخست لەگەڵ ئەمەشدا چەندێکی ناخۆشییان بووبێ ژنیان لەیەکدی خواستووە. لەبارەی حەماغاوە گوتبووی ساف و دڵپاک بوو ئەگەر فەرمانی کارێکی خراپی بدایە یان خۆی خراپەکەی بکردایە دوای سەعاتێک لێی پەشیمان دەبۆوە و هەزار پاڕانەوە و تۆبەی لەبەر خوا دەکرد. خزمی وەهای هەبوون ئەگەر بە قسەی بکردنایە ڕۆژی دە کەسیان پێدەکوشت.

مراد دەنووسێ قائیممەقامێکی تورک دێتە کۆیێ و حەماغا هەڵدەپێچێ بۆ پارەی بەقایای قەرزی حکوومەت. گۆیا لەژووری خۆی بە حەماغا دەڵێ یان پارە یان بەندیخانە حەماغاش دەست لەسەر خەنجەرەکەی دادەنێ و پێی دەڵێ بەپیاوی وەک تۆ حەبس نابم خەبەر بە حاجی ئەسعەداغای حەوێزی دەدەن کە خەزووری حەماغا بووە بە پەلە دێت و حەماغا هەڵدەستێنێ و پێی دەڵێ هەڵستە چاوت ڕەش بووە لەسەرای حکوومەت دەست لەسەر خەنجەر دادەنێی؟ دواتر ناوبژی لە نێواندا دەکات و قائیممەقام دەهێنێتەوە لای حەماغا ئەویش ئێسترێکی سوور عەنابی ڕەهوانی پێشکەش دەکات کە

حەماغا دەچێتەوە سەردانی قائیممەقام ئەویش شیرێکی بچووکی دەسک زێڕی دەداتێ گۆیا دوای ماوەی چەند ڕۆژێک قائیممەقام داوای شیرەکە لە حەماغا دەکاتەوە و بە نامەی ئەوە کە هی خۆی نەبووە حەماغا شیرەکەی بۆ دەنێرێتەوە ئەمجارەیان حاجی ئەسعەداغا بە حەماغا دەڵێ تۆش بنێرە ئێسترەکەی لێوەربگرەوە حەماغا گوتبووی حاجی ئەمن حەمەدم حەمەد ئەو قائیممەقامەش کەس نازانێ کوڕی کێیە من وەکوو ئەو ناکەم. لەبارەی هەرای نێوان حەماغا و شێخ بزێنییەوە مراد حیکایەتێکی خۆشکەڵە لەزاری ڕەحمانی کوێخا حەوێزی شاخەپیسکە «ڕەحمان مامی مرادە» دەگێڕێتەوە گوتووەتی، حەمەد تیماری خەڵقی دێی تیمارۆک بۆی باس کردم، گوتی بە جحێڵی لەگەڵ شێخ بزێنییەکان بووم وردەبەندم بۆ دەگوتن ناویان نابووم حەمەدحەیران. شەوێک لە دیوەخانی تۆفیق ئاغا لە دێی خرابە دانیشتبووین یەکێک گوتی ماڵە دۆمێک هاتوون خاوەنەکەیان حەیرانی خۆش دەڵێ تۆفیق ئاغا بەدواییدا هەنارد کە هات داوای حەیرانیان لێکرد ئەویش دەستی خستە بناگوێی و تێی هەڵکرد.

حەیران وەرە لە ئاوی غازری یاخوا دزەیی برایماغاتان بمری ئەو هیچ عەشیرەت خۆی لەبەر ڕاناگری.

حەمەدتیمار گوتی منیش دەستم لەبناگوێم ناو ڕاسامە ئەم حەیرانە: سواران لەمن هەر ڕاوەڕاوە نێچیری خەڵک تەیر و تواڵە بەلا نێچیری تۆفیق ئاغا قوڵینگەکەی شاپەڕ بەخوو ناوە.

حەمەدتیمار گوتی کە لێبوومەوە تۆفیق ئاغا دەمانچەکەی هەڵکێشاو ڕووی کردە کابرای دۆم و پێی گوت، سەگباب دزەیی کەی پیاوی وەهایان هەبوو ئەگەر حەیران دەڵێی وەک حەمەد بڵێ حەمەد حەیران دەزانێ. زۆر نەمابوو دۆمەکە بکوژێ. زۆری پێنەچوو گوتیان چەند کەسێک لە کۆیەوە هاتوون، بە ئەمری تۆفیق ئاغا بەدوایاندا چوون کە هاتنە دیوەخانە تۆفیق ئاغا لێی پرسین چ دەنگ و باسە؟ گوتیان ئاغا ئێمە ئەوەندە دەزانین بەیانی مشکی و

پشتێنی کۆیی و بڵباسان پڕی ئێرە دەبێ حەماغا زەخیرەیەکی زۆری لەبۆ تیمارۆک و ئەو دێیانەی نزیک بەئێرە ناردووە.

تومەز قسەی کابراکان ڕاست بوو. سبەینێ تاریک و ڕوونی بەیانی تەقە لە دەوری خرابە دەستی پێکرد شێخ بزێنییەکان بە پەلە بۆی دەرچوون و بەرەو زێ تێیان تەقاند مەشکەیەکی گاوسی گەورەی ماڵی تۆفیق ئاغا بە سێپاکەوە پڕ لە ماست بوو بە ژەنین بەجێمابوو سوارێکی بڵباس تەقڵەکوت چووە پێش دەرگای ماڵی تۆفیق ئاغا کە مەشکەکەی دیت لە وڵاغەکەی دابەزی و مەنجەڵێکی ڕاکێشایە بن مەشکەکە و خەنجەرەکەی هەڵکێشا و گوتی، قوتە ڕەسووڵە بۆ کەینێتە. خەنجەرێکی لە مەشکەکە کوتاو ماست و ماستاو هاتە خوارەوە مونجەڵی پڕ کرد ئنجا ئەسپەکەی هێنایە سەر مەنجەڵەکە «بێگومان ئەسپی هەرام حەز لە ماستاو ناکا».

تێبینیم بەرانبەر بەم حیکایەتە ئەوەیە کە حەمەدتیمار بەچاوی خۆی کابرای بڵباسی نەدیتووە مەشکە بدڕێت، چونکە خۆی پیاوی تۆفیق ئاغا بووە و لەگەڵ ئەودا بۆی دەرچووە دەبێ لە خەڵقی دیکەی بیستبێ. هەرچونێک بێ ڕووداوی ئەوتۆیی ڕێی تێدەچێت و جێی باوەڕ پێکردنە قسەو ڕەفتاری کابرای بڵباسیش پتر بەلای ڕاستییدا دەچێتەوە نەک هەڵبەستن. حیکایەتەکە لایەنی هاریکاری بڵباسانیش لەگەڵ حەماغادا ڕادەگەیەنێ کە بەشێوەیەکی گشتی و وێنە لەشکر بووە نەک تاک و تەرای یەک دوو نۆکەر و چەند بۆرە پیاوێک. ڕێکەوت وەها بوو لە شەڕی چنارانیش بڵباسەکان لەگەڵ مەلاحەوێزاغادا یەک بەرە بوون واش بزانم ئەوسا سواراغا نەمابوو سمایلاغای کوڕە گەورەی کە جارێ نەشرسکابوو سەرۆک هۆز بوو. بڵباسەکان لەدێی گردجان قایمەکاری و دروستاییان کردبوو کە ماڵی سەرۆکیان چەند ساڵێک بوو لە سەرخمەوە بۆ ئەوێی ڕاگوێزتبوو بڵباسەکان هێرشیان نەکرایە سەر، بەڵام هەرچی بووبایە بێگومان دەستەوەکەرییان هەتا مردن دەبوو، چونکە چ جێگایان نەبوو لە هەڵاتندا خۆی بۆ هەڵکوتن دەشتایی بیتوێن کە نشیمەنی بڵباسەکانە بارێکی تایبەتی بەملدا بڕیوون، چونکە هیچ

شاخ و هەڵەت و پەڵەتی تایبەتی خۆیانیان نییە پێوەی قایم بن هەرچی شاخی دەوری بیتوێن هەیە هی غەیری بڵباسە ئاو و بەراوی بیتوێنیش بە زۆری ئەمیرییە «یان ئەمیری بوو» لەبەر ئەمە ڕزق و ڕۆژییان بەند بوو بە مڵکی میری.

ئەم هەڵکەوتە وەهای لە سواراغا کردبوو کەوا هەتا بۆی بکرێ دڵی قائیممەقام و موتەسەڕیف ڕابگرێ هەر ئەم هەڵکەوتەش بوو تا ڕادەیەک داخوازی دەکرد کە بڵباس لەگەڵ خاوەن مڵکەکانی بیتوێن بەدۆستایەتی ڕابوێرین بۆ ئەمەی هەرای ناو بیتوێن بێئاگایان نەکا لەدەسدرێژی جیرانە شاخاویەکانیان. خۆشناو و ئاکۆ و شیلانە و پژدەری بۆ بڵباسەکان جێی مەترسی بوون، غەفوورییەکان کە بنەیان لە کۆیەیە و مێوانی بیتوێنن ڕی بەدیییان لەگەڵدا دەکرا حەماغا پیاوێک بوو حەزی بە کەسابەت دەکرد نەک بە داکردنی دز و ڕێگر چاویشی لە پڕکێشی مڵک و بەراو نەبوو ئەوەی کوردی گوتەنی دراو خرِیدە نەبووبێ دەستی بۆ نەبردووە.

کاکەزیاد بۆمی باس کرد گوتی حەمەشین ناوێک لە عەشیرەتی «کورد» ناوی ئازایی دەرکردووە لە شەڕەکانی دژی شێخ بزینییان ئەم «حەمەشین»ە هەرچەند کورد بوو پێی دەگوترا بڵباس. وادییارە تێکەڵی بڵباسەکان لەگەڵ خەڵقەکەی سەر بە حەماغا ئەوەندە بەتین بووە حەمەشینە کوردەی کردووە بە حەمەشینی بڵباس.

مراد لەزاری کوێخا حەویزەوە پێمان دەڵێ ڕۆژێک حەماغا مێوانێکی زۆری دەبێ کە نانی نیوە ڕۆژە دەهێنن بۆ دیوەخانە هەوەڵ جار سینییەکان لە هەیوان دادەنێن لەگەنە چێشتەکان ئەوەندە گەورە بوون و هەڵمی وەهایان لێهەڵدەستا دەتکووت دووکەڵە. پیاوێکی شاخەپیسکەی ناوی «ڕۆستەمە قولە» بوو تەماشای ئەو چێشت و هەڵمە دووکەی کرد هاواری لێهەستا ماڵی کێیە وا ئاووری تێبەر بووە. خەڵقەکە دایانە پێکەنین حەقیشیان بوو. لە سۆنگەی مەڕدارییەوە حەماغا سەرنجی لە کژی گەرما و سەرما ڕاگرتووە تا

ئەوەی حیسابێکی بۆ حاڵ و باری مێگەلەکانی کردووە لەگەڵ ئەو کژانە بگونجێ.

وەک کە لە زۆر کەس بیستراوە دەگوترا بەپێی حیسابی حەماغا ساڵ وەها وەهایە. حەماغا ڕێنموونی شوانکارەکانی خۆی دەکرد بۆ چوونە کوێستان و تفاق داکردن و هەموو سەروبەرێکی ئاژەڵ بەپێی ئەو حیسابەی کە خۆی ڕایدەگرت. دەڵێن حەماغا هەموو ساڵێک هەتا دە ڕۆژیش دوای نەورۆز تەقیەی لە سەرمای زستان کردوە بۆ مەڕەکانی. سۆفی سەدیقی حاجی سۆفی موستەفا باسی کردوە کە حەماغا گوتوویەتی ساڵێک لە ساڵان عەشیرەتی شکاک لە ڕۆژی نەورۆزدا باریان لێنا بۆ دەرەوەی دێهاتەکانیان شەو لێیان بوو بە فرتەنە و بەفر و باران و ڕەهێڵ خەسارەیەکی زۆر لە مەڕ و ماڵاتیان کەوت.

کوێخا حەوێز دەگێڕێتەوە جارێکیان حەماغا وەڵامی بۆ دەنێرێ چەندێکی لەدەستی دێ سوار لەگەڵ خۆیدا بهێنێ ئەویش بە خۆی و سواری دێیەکانی شاخەپیسکە و کانی دەربەند و گوپتەپە دەچێ بۆلای حەماغا.

پێی دەڵێ حەوێز نیازی سەردانی شێخ قادری سندولانم هەیە. دووای نان و نوێژی نیوەرۆ دەکەونە ڕێ کژپایز بووە ڕۆژ کورت شەو درێژ بەمانگەشەو لە دەشتی بیتوێن بەرەو پژدەر دەڕۆن کوێخا حەوێز دەڵێ گوێم ڕاگرت دەنگی حەماغام بیست لەبەر خۆیەوە «ئایای» دەڵێ بەم بەیتە:

هەی داد هەی بێداد لەگەڵ مامەوە

خۆشی و ترشی بە تاڵی دامەوە

کوێخا بەهەلی دەزانی و وڵاغەکەی بۆ تەنیشت وڵاغی حەماغا لێی دەخوڕێ و پێی دەڵێ، ئێمە بەیتی ئایای وەک جەنابت ناڵێین حەماغاش دەپرسێ ئەدی کووی دەڵێن؟ کوێخا دەڵێ ئاغا وەهای دەڵێین:

هەی داد هەی بێداد لەگەڵ مامەوە

ئەوەی بەک.. کردم بەقنگ دامەوە

حەماغا دەڵێ حەویز یەکجار وەهاش نا بەڵام بەخودای ئیشی ئەم زەمانە هەمووی وەهایە. ئنجا پێی دەڵێ حەویز لە ماڵی شێخ چاوت بە هەرچی بکەوێ نەکەی بە جواب بێی و بپرسی. تومەز ترساوە نەکا قسەی بەیتی ئایای بڵێتەوە.

کوێخا حەویز لە وڵاتی کۆیێ زۆر بەرچاوبوو، گەلێک بەولای کوێخایەتییەوە حورمەتی دەگیرا، قسەزان و هوشیاریش بوو دانەدەما. قسەی نستەفی زۆر بوون. کوێخا و خزمانی لە عەشیرەتی کوردن. لەدەمێکەوە هاتوون بۆ وڵاتی کۆیێ و لە شاخەپیسکە و گوپتەپە و چەند دێیەکی دیکە نیشتەجێ دەبن. پێشتر لەبەری بابان دەژیان. هۆزەکەیان سێ تیرەیە، کەڵوی، مەندەمی، ئاغاسووری. کوێخا حەویز و کوێخا ئەحمەدی گوپتەپە کەڵوی بوون. ئەم تیرەیە بە تایبەتی سەر بەحەماغا بوون، مەندمیەکان سەر بە حەسەناغا بوون. کوێخا گوتبووی کە عەشیرەتەکەمان دێتە ئەو ناوە هەمووی چۆل بوو ئاوەدانیان کردۆتەوە. ویستم بزانم ئایا ئەوان یان غەفووری زووتر هاتوونەتە وڵاتی کۆیێ، بەڵام جوابێکەم وەرنەگرتەوە. بە مەزەننە دەبێ غەفووری پێشتر دامەزراو بووبن ئنجا هۆزی کورد لە بابانەوە بۆ سۆران پەڕیبێتنەوە، چونکە هەموو هۆزەکان سەر بە غەفووری بوون، بە زاهیر ئەگەر غەفووری لە دەمی هاتنی ئەواندا دەسەڵاتدار نەبووبن ناچار دەبوون دەست بە بنگەیەکی دیکەوە بگرن.

مراد دیار لەژێر سەرناوی «کۆیە و بلّباس»دا ڕووداوێک دەگێڕێتەوە کە تا ڕادەیەک پێوەندی بە ماڵی ئێمەوە هەیە لە کۆتاییشدا دەورێکی حەماغای تێیدا باس دەکات. دوای ئەوەی کە دەڵێ حکوومەتی عوسمانلی لەبەرەو کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیدا خەڵکی تاڵان دەکرد بۆ پێکەوەنانی ئازوقەی لەشکرەکانی، لە کۆیەش لەدەمی «شارەوانی- رئاسة بلدية»ی عەوڵاغای حەوێزیدا ماڵی حەماغا بەسەریدا دراو چی دانەوێڵە و دەغڵ هەبوو لەشێوەی

تالآن کردندا بردی، حەماغاش بەسەرە خۆی نەهێناو ڕێی نەدەدا کەس ئەو باسە بکوتێتەوە، دێتە سەر گێڕانەوەی ڕووداوێکی ناخۆش. گۆیا لە بیتوێن پیاوێکی عەولاغا ڕووت دەکرێ و کەلوپەلێکی پێی بووە لێی دەستێنن بێ ئەوەی بزاندرێ ڕێگر کێ بووە. ئنجا لەزاری میرزا محەممەد ئەمینی حاجی میرزا قادر دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی بڵباس ناوی «حەمەڕەش» و برای «عەلی بێشیر» بوو لەبنەماڵەی ئاغاکانی بڵباس، دەقی قسەی میرزا محەممەد ئەمین لێرە بەدواوە ئەمە دەڵێ: «هەر کات ئەهاتە کۆیە ئەبوو بە مێوانی مەلامحەممەدی کۆیە کە بەناوبانگ بوو بە «جەنابی مەلا، مەلای گەورە» ڕۆژێک حەمەدەڕەش دێتە کۆیە لە نزیکی سەرا تووشی ئەبێ بە تووشی ماڵی عەولائاغاوە... «وا دیارە وشەیەک پەڕیوە، چونکە تووشی نۆکەرانی یان دەستەی ماڵی عەولاغا بووە نەک ماڵەکەی». حەمەدەڕەش مشکییەکی لەسەر دەبێ، پێی دەڵێن ئەو مشکییەت لە پیاوەکەی ئێمە سەندووە کە لەدەشتی بیتوێن ڕووت کرا، دیارە تۆ ڕووتت کردەوە. حەمەدەڕەش دەڵێ بێئاگام.. خولاسە قەپوقڕ پەیدا دەبێت و حەمەدەڕەش دەکوژن، گۆیا لە ماڵی باوکم دەمرێ: بەبرینداری دەیگەیەننە ماڵی ئێمە. میرزا محەممەد ئەمین لە زاری تەهای حەسەنی پیرەبان کە ڕەزەوانێکی پیرەڵی بووە دەگێڕێتەوە گۆیا خەڵق حەمەدەڕەشیان هاویشتۆتە سەر پشتی کەرێک بە چەند کەسان گرتوویانە تا گەیاندوویانەتە ماڵی مەلای گەورە، بەدرێژایی ڕێگەحەمەدەڕەش دەستی لە بناگوێی ناوەو گۆرانی گوتووە. کە ئەو ڕووداوە گەییشتە حەماغا گوتی: ئاخوا خێربێ خوایە بمانپارێزی خوایە بەدوورمان کەی.

کە حەمەدەڕەش مرد چەندڕۆژێکی بەسەرداچوو بڵباس کەوتنە خۆڕێکخستن بۆ وەرگرتنەوەی خوێنی حەمەدەڕەش. بەیانییەک لەشکری بڵباس گەییشتە کۆیێ. لەپێشەوە خۆیان لە قشڵەی سەرکەکۆن قایم کرد ئنجا بۆ ماڵی عەولاغا هێرشیان هێنا. ڕەحمانی کوڕی کوێخا حەوێزی شاخەپیسکە دەڵێ کەریماغای مەلاواحیداغا کە برازای عەولاغا بوو لەگەڵ تۆفیقی خاڵدەو

حەسەنەخرە پارێزگاری ماڵی عەولاغایان دەکردو هێرشیان دەگێڕایەوە دواوە. ڕێکەوت وەهابوو کوڕەگەورەی عەولاغا کەناوی «ظاهر» بوو لە دەمی سەرکەوتن بە پێپلکاندا گوللەی بەردەکەوێ و دەکوژرێ. گۆیا چەند ماڵێکیش لە بەفری قەندی و قەلاتی «دووگەرەکن لەکۆیە، بەفری قەندی، قەلات» تالان دەکەن، لەوانە ماڵی عەبدوللای باوکی سابیرئەفەندی کە بوو بە مدیری پۆلیس و ماڵی حاجی سمایلی باوکی مامۆستا بەکری سەرۆک دادگای ئێستاکەی حوکمی زاتی. زۆر نەمابوو ماڵی عەولاغاش بگرن، چەند ولاغی زیادیان پێبوو بۆ تالانی ماڵی عەولاغایان تەرخان کردبوو، چی پەنجەرە و دەرگەی دیوەخانەی عەولاغا هەیە بە گوللە ڕشاندبوویان.

ساڵحی عەولاغای غەفووری کە خوارزای حەماغاش بوو، لەگەڵ هی دیکەش دەچێتە لای و پێی دەڵێ، هەرچەند بەسەر ماڵی عەولاغایان داداوە، بەلام عەیبی هەموو شارەکەیە. لە دوورەوە خەڵق دەڵێن بڵباس بەسەر کۆیەی داداوە، نابێ تۆ گوێ بدەیتە خراپەیەکی بەرەی عەولاغا لەگەڵ تۆیدا کردبێ. حەماغا قسەکانی دەچێتە دڵەوەو دەڵێ فانۆسێکم بۆ هەڵگرن. بەو شەوە بۆ ناو تەقە دەڕوات و دەگاتە سەرۆکی لەشکری بڵباس و پێی دەڵێ بەسە چی دیکە ئەو تەقوتۆقە مەکەن. بڵباسەکان لەشکریان دەکێشنەوە، بەلام لەگەڕانەوەدا چەند ماڵێکی باغچەوان و ڕەزەوانی ڕووباری کۆیەش تالان دەکەن. میرزا محەممەد ئەمین لەو موناسەبەیەدا گوتوەتی عەولاغا لەگەڵ حەوێزییانیش ناخۆشی و ناکۆکی ناوەتەوە، هەر بۆیەش بوو لەو شەوەدا بە دەنگییەوە نەچوون.

من باسی کوژرانی ئەو حەمەدەڕەشەی برای عەلی بێشیرم لە ماڵی خۆمان بیستووە، دەزانم مێوانی ئێمە بووە، بەلام ڕاستییەکەی بەبیرم نەماوە یان نەمبیستووە بۆچی باوکم خۆی لێ بەساحێب نەکردبوو، خۆ ئەگەر بەهیچ جۆرێک لە جۆرەکان بەدەنگیش هاتبێ من هیچی لێ نازانم. دەمێنێتەوە مەسەلەی شەدەی سەری حەمەدەڕەش کە ناسرابێتەوە هی پیاوی عەولاغا بووە. ئەمیشیان ڕاستی و درۆیی هەڵدەگرێ. بەهەمەحاڵ باوکم خۆی لەگەڵ

بلْباساندا لەسەر ملْکەکانی جەلیزادان لە قەلْەمڕەوی ڕانیە هەمیشە لە نیزاع و نارەحەتی دابوو، تا ئەوەی نیزاعەکە بۆ ئێمەش بەجێما و من خۆم گەلێکی تێدا ماندوو بووم. ئەو نیزاعە تا سالآنی 1973، 1974 دەوامەی کێشا، «اصلاح زراعی» بەخێری خۆی سەرێشەی لەکۆڵ کردینەوە...

قسەیەک لەبارەی عەولآغاوە. ئەم مرۆیە ئامانجی فراوانی هەبوو، بەخۆی و باوک و باپیرانیەوە دەنازی. ئەگەرچی دەستی بە قەدەر ئامانجی نەدەڕۆیی، بەلآم لە تەقەلآ ماندوو نەدەبوو. نەسەلمێنیش بوو بەهۆی پێوەندی خۆی و حاجی تاهیراغای باوکی و حاجی بەکراغای باپیری بە بەغداو بە پیاوە گەورەکانی دەولْەتی عوسمانلییەوە مەیدانی کۆشەشی بەربلآو بوو. وابزانم ڕوتبەیەکی ڕەسمی یان نیوە ڕەسمیشی هەبوو. ناوی دەرکردبوو تا ئەوەی وەزیرێکی ئێرانی «احتشام السلطنة» کە بە کۆیەدا بەرەو ئەستەنبۆڵ دەڕوا لە عەولآغا مێوان بووبوو. لەگەڵ موستەفا کەمالیش کاغەز و نووسیاری هەبوو. نیزاعی لەگەڵ غەفووریيانیش لە ئاکامی تەبیاتی خۆی و بەخۆدا ڕاپەڕموونەوە بووە. زاهیراغای کوڕە گەورەی عەولآغا بەباشی ناوی نایەت، ئەمما فەتاحاغا و عەزیزاغا و نامیقاغا هەریەکە لە مەیدانی خۆیدا باسی پیاوەتییان کراوە. شەفیقاغا لەنیوەی ڕێگەی بەینی عەولآغا و ئەو سێ برایانەیدا بوو. ڕەفیقاغاش لاتەریکێکی بێمەبەس و بێزەرەر بوو مەگەر زەرەری لەخۆی دابێت. ئەمەیە بە کورتی و بێلایەن ڕای و باوەڕم بەرانبەر سەرجەمی مەسەلەی عەولآغا کە کاپتن «های»ش زۆری پێوە خەریک بووە. ئەمجا پێی ناوێ من بلْێم، چونکە لە خۆوە دیارە لە ئاست دەسەلآتە بێسنوورەکەی حەماغادە، عەولآغا هەتا بلْێی لە بارێکی بێتالعانەدا بووە.

ئەگەر تەقیەم نەکردبایە لەبەر هەندێ ڕەخنەی کە بە زاهیر وەلآمیان نادرێتەوە قسەی زۆر کەسی خاوەن قسەم لا هەیە کە تا سنووری ئەفسانە باسی سەخاوەت و باسی تالع و بەختی حەماغایان کردووە. کەسانی وەها هەبوون لێیانم بیستووە کە سەخاوەتی حەماغا لە پایەیەکدا بوو بەرەکەتی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا تا ئەوەی بەکەس ساغ ناکرێتەوە چەندەها داهات و

مەڕوماڵ و دەغڵ و دانی حەماغا بەپای پیلان داغان کراوە و حەماغا خەبەریشی نەبیستووە بایی سەری دەرزیش تەئسیری لە سامانی نەکردووە وەک کە دانەدەغڵێک و گیسکە گەڕێکیشی لێ نەدزرابێ. بیستووشمە کە بەختی حەماغا وەها یاربووە ئەگەر بە خواریشی هاویشتبێ ڕاستی هێناوە، بەڵام پێویست نابینم لێرەدا بەبەر باسی وەهاوە هەڵبنیشم کە ئەگەر بەڵگەی لەگەڵدا نەبێ بەغەیبی و ئەفسانەیی لەقەڵەم بدرێ، بەڵگەش ئەگەر هەبووبن، دوای مردنی ئەو کەسانەی قسەم لێ بیستوون شۆراونەتەوە. وەها باشترە بچمەوە بۆ قسەیەکی میرزا محەممەد ئەمینی حاجی میرزا قادر کە مراد لێی دەگێڕێتەوە گوتوویەتی. حاجی میرزا قادری بابم بۆ مامڵەتی بازرگانی هاتوچۆی شارانی دەکرد. جارێکیان لەگەڵیدا چووم بۆ سابڵاغ. ڕۆژێکیان مامڵەتمان لەگەڵ توجارێکی گەورەی سابڵاغ کە ناوی ئاغاعەلی بوو دەکرد، لەوتووێژدا پێمان گوت ئێمە خەڵقی کۆیە و خزمی حەماغاین. ئاغاعەلی گوتی، حەماغا یان حەمەپاشا؟ ئەو پیاوە ئەگەر لای ئێوە نەبوایە حەمەپاشا دەبوو. دوای ئەمە حیکایەتی خۆی لە ئاست حەماغادا گێڕایەوە گوتی، ساڵێکیان لەگەڵ چەند توجارێکی سابڵاغیدا هاتینە شاری کۆیێ، کڕین و فرۆشتنمان کرد تا پارەم بڕا جارێ پێویستیشم مابوو بە هەندێ شتمەکی پێویست بۆ سابڵاغ. کەس دەستی نەگرتم بەقەرز پارەم بداتێ. یەکێکی کۆیی گوتی، خاڵە ئیشی تۆ لای حەماغا پێکدێت. سەرت نەیەشێنم لەگەڵم هات تا ماڵی حەماغای نیشان دام و خۆی گەڕایەوە. کە چوومە حەوشی دیوەخانەکە قەرەباڵغی ڕاوەستابوو. لەگەڵ برادەرەکانی سابڵاغیم چووینە ژووری دیوەخانە، بەپرسیار حەماغام ناسی، یەکێک بوو پیاو لە دەست و قەننەکەی دەتووقی. ڕووم کردە ئەو شەخسەو گوتم، ئاغا من بازرگانێکی سابڵاغیم، پارەم لێبڕاوە و پێویستیشم بە ماڵی بازرگانی ماوە بیکڕم، هاتوومە خزمەتت بەو نیازەی چەندێکی لێکیش دووربین بەنزیکم بزانی. ئەویش گوتی یاخوا هەر بەخێربێی. نا، نا لێکدی دوورنین زۆر لێک نزیکین، کۆیە و سابڵاغ لەکن من یەک شارن ئەمەش پارە، خزمی وەکوو ئێوە هەر زۆربێ... دەستیم ماچ کرد

و هاتمە دەرێ و ماڵی پێویستم کڕی و بارمان کرد بۆ سابڵاغ. ساڵی دواتر پارەکەم بۆ بردەوە. سێ ڕۆژ لای بووم هەتا بە هەر حاڵێک بێ پارەکم پێدایەوە. ئنجا برادەری کۆیی حەماغا لای ئێمە حەمەپاشایە میرزا محەممەد ئەمین لە کۆتاییدا گوتی ئاغاعەلی لەسایەی حەماغاوە زۆری قەدر گرتین و خزمەتی کردین.

ئەوەی بیزانم لەو ساڵانەی نێوەندی حەفتاکاندا کاکەزیادی حەماغا گوزەر و گوزەرانی کەوتەدیوی ئێران. کۆیی ئەوتۆ پێی باوەڕ بکەم بۆی گێڕامەوە گوتی لە سابڵاغ خەڵقەکە بە چاوی شەخسی حەماغا سەیری کاکەزیادیان دەکرد و حورمەتی ئەویان پێدەداو وەهاش دەبوو کە بەدەر دەکەوت دەیانگوت حەماغا هات… بنەماڵەی پێشەوا قازی محەممەد ئەوپەڕی ڕێزیان لێنا.

مراد لەزاری ڕەحمانی مامی خۆی دەگێڕێتەوە، جارێکیان سەپانەکانی خەرمانی حەماغا لە دەشتی کۆیێ دمەو ئێوارە دێن بە حەماغا دەڵێن، چەند شەوێکە مارێکی ڕەشی بێڕەزا دێتە سەر خەرمانەکە ئێمە ناوێرین لەبەر ئەو مارە بە شەو بۆ پاسەوانی نزیکی خەرمانەکە بکەوینەوە… حەماغا گوتی، وڵاغم لەبۆ حازرکەن. خەنجەرەکەی هەڵکێشاو گوتی ددانی مار ئەوەندووکەیە تەماشای ددانی من بکەن «دییارە مەبەستی ئەوەبووە کە ددانی ئەو لەهی مارەکە گەورەترە». پەلەی لە خەڵقەکە دەکرد کە بە زوویی وڵاغی بۆ زین بکەن، هەتا پیاوێکی خۆی، ئەحمەدی مەحموود، کارەکەی بە ئەستۆوە گرت و لێی سوار بوو چوو مارەکەی کوشت و بە کوژراوی هێنایەوە دیوەخانە. وادییارە ئەو مارە زۆر زل بووبێ، چونکە ڕەحمانی دەڵێ «شاری کۆیە هاتە تەماشا کردنی ئەو مارە گەورەیە». ڕاستییەکەی، من خۆم ئەم ڕووداوەم نەبیستووە، بەڵام گومانی لێ ناکەم چونکە هیچی ئەوتۆی تێدا نییە گومانی لێ بکرێ ئەوەندە نەبێ کە هەموو ئەهلی شار نەهاتوون بەوشەوە بۆ سەیری کەلەشی مار.

کوێخا حەوێز دەگێڕێتەوە دەڵێ ساڵی گرانی بیست کەسی شاخەپیسکەیی چوون بۆ ئاشی کولۆش «لە کۆیێ و زۆر شوێنی دیکە پێی دەڵێن کرۆژ. ڕەنگە لە بنەڕەتدا کولۆش ڕاستتر بێ، چونکە گۆڕانی ناو بەرەو سووکی و ئاسانییەوە دەڕوات، لامی قەڵەویش لە کۆیێ و زۆر لەهجەی وەک هی کۆیێ لەخۆوە بە « ر »ی لاواز دەگۆڕێ» تێیاندا بوو تەنەکەیەک،نیوتەنەکەی دەغڵ پێبوو هی وەهاشیان تێدابوو بارێکی تەواوی بەباراش لەگەڵدابوو. ئەو ساڵە کەس دڵی نەدەهات دەغڵی خۆی تەسلیم بە برادەری بکات، چونکە مستێکی لێ خورابایە بۆ ئەو قات و قڕییە زۆر بوو. تاهیراغای مەشوور بە تاهیراغای شیواشۆک ماڵی لە کولۆش بووە دەغڵەکەی لەو خەڵقە گێڕابۆوە و دەستی بەسەردا گرتبوو. خەڵقەکە بە دەستی بەتاڵ هاتنەوە. لێی سواربووم چوومە لای حەماغا لە کۆیێ و ڕووداوەکەم بۆ باس کردو گوتم تاهیراغا ئەگەر نانی نەبوو ولاغی ناردبایە من بۆم دەنارد. ئەگەر لەبەر تۆ نەبێ وەها و وەهای لێدەکەم و باراشەکانی پێدەهێنمەوە شاخەپیسکە. حەسەناغای برای حەماغا ڕووی تێکردم و گوتی نا نا ئەتوو ناتوانی لەگەڵ غەفووری شتی وەها بکەی. ئەتوو ئەو پیاوە نی. حەماغا بەتوورەیی ڕوو دەکاتە حەسەناغاو پێی دەڵێ، قسەی لەوجڕ مەکە. حەوێز دەتوانێ وەها بە تۆش بڵێ ئەویش غەفوورییە و برایەکە وەکوو تۆ. بە پیاوێکی ئەحمەد ناوی گوت، سواربە بۆ کرۆژ بڕۆ بە تاهیر بڵێ دەرکی یەک بار بکاتەوە لێی قەبووڵ ناکەم، دەبێ هەموو دەغڵەکە بۆ خاوەنەکانیان بنێرێتەوە. کوێخا حەوێز دەڵێ هەتا هاتمەوە شاخەپیسکە سەرپاکی ئەو دەغڵە گەییشتبۆوە دێ.

تێبینی لەم حیکایەتەدا ئەوەیە کەوا ناشێ ئەو گرانییە هینەکەی ساڵی 1917 بێ، چونکە لەو ساڵەدا بەپێی ئەوەی پێشتر باسمان کرد تاهیراغا ماڵی لە شیواشۆک بووە و بە بۆنەی بەخێوکردنی کاکەزیادی حەماغاش لەماڵی ئەودا حەماغا هەموو مەسرەفی ماڵ و دەیوەخانەی کێشاوە. حەسەناغای برای حەماغاش وەکوو باسمان کرد لە شەڕێکی شێخ بزێنییان کوژرابوو، ڕەنگە بەر لە گرانی 1917 بە 12 ساڵێک حەسەناغا کوژرابێ، چونکە وەک گوتمان

قادراغای سمایلاغا کە ناوی دەرکردبوو لە شەڕەکانی شێخ بزێنی لە سەرەتای 1906ز. دا مردووە دییارە حەسەناغا زووتر لەو ساڵە کوژراوە. من گومانم لە قسەکەی کوێخا حەوێز نییە، تەنها لە حاڵ و باری ڕووداوەکە تێبینم هەیە.

دیسانەوە کوێخا حەوێز بۆمان باس دەکات و دەڵێ کە برنجی مەرەزەکانی بیتوێن پێدەگەییشت لە زۆر دێهاتەوە سەپانی بۆ دەچوو. ئەو سەپانانە بەشی سەپانییان لە برنجەکە وەردەگرت و پتریش لەو پشکەیان لێدەدزی.
ڕۆژێکیان حەماغا پێی گوتم، حەوێز ئەو سەپانانە هەموو برنجەکە دەدزن کاری وەها عەیبە و گوناحیشە، ئەمجا ئەگەر غەوارەش شتی وەها بکەن پێم خۆش نییە ئێوە وەکوو ئەوان بن، چونکە ئێوە خۆیین. کوێخا حەوێز پێی دەڵێتەوە ئاغا ئێمە بۆ تەماع برنج نادزین. دەڵێ ئەدی لەبۆچی؟ کوێخا دەڵێ، کە پێغەمبەر «د.» چووە ناو بەهشت دەنکێ چەڵتووکی بەجبەوە نووسابوو، کە هاتەوە سەر زەوی ئەو دەنکە چەڵتووکە برنجی لێداکەوت ئێمە بۆیەیە بە پیرۆزی دەزانین و لە دزینی ناگەڕێینەوە. حەماغا پێی دەڵێ، حەوێز بۆخاتری خوا لە مەلایانت نەبیستبێ هیچی ناهێڵن.

کوێخا حەوێز ڕۆژگارێکی درێژی لەگەڵ حەماغادا ڕابواردو و لێی شارەزا بوو، چەندین قسەی نەستەق و لەتیفەی ئەوتۆشی لەگەڵ ئەوەدا هەبووە.
ڕاستییەکەی کوێخا حەوێز داستانێکی سەربەخۆ بوو. لەبارەی حەماغاوە گوتووەتی، نانی بە موتفەڕک دەشیا لەچاو ئاغای دیکەدا، چونکە بە عیبادەت بوو، نوێژ و ڕۆژووی پوخت بوون، لەشی بۆ عیبادەت سووک بوو هیچ تەنبەڵی تێدا نەدەکرد بە زۆری لە دیوەخانە مەلای هەبوو بۆ پێش نوێژی. بایەخ و ڕێزی مەلا دیندارەکانی بەزیادەوە لاهەبوو. نەیدەگوت ئەم خواردنە ناخۆم، هەرچی هەبوایە پێی ڕازی بوو. لەزاری ئەوەوە کوێخا دەڵێ بەخواردن ڕازی نەبوون ڕقەبەری کردنە لەگەڵ خوادا. نە بەچاوی سووک سەیری خەڵقی دەکرد و نە ناوی کەسیشی بە سووکی دەهێنا. هەر پرسێکی پێکرابایە ئەگەر بیزانیبایە وەڵامی دەدایەوە. ڕقی لە پیاوی درۆزن و خۆهەڵکێش بوو.

کەسێکی مەدح و سەنای خۆی بکردایە بە پیاوی نەدەزانی، مەیدانیشی نەدەدایە خۆهەڵکێش قسە بکات، چونکە بەلایەوە یەکێک خۆهەڵکێش نەبێ گوێ لە خۆهەڵکێش ناگرێ. پێی ناخۆش بوو کەسێک پرسی پێنەکرابێ لەخۆوە وەڵامی پرسیاری غەیری خۆی بداتەوە. حەماغا لەبارەی ئەو جۆرە کەسانە گوتووەتی زۆرکەس هەیە پرسیار لە مەلا دەکرێ ئەو لەجیاتی مەلا جەواب دەداتەوە جارێ مەلاش لەپرسیارەکە حاڵی نەبوە.

کوێخا حەویز دەڵێ ئەگەر حەماغا فەرمانی بە خراپە دابایە زوو لەسەری پەشێمان دەبۆوە، ئنجا ئەگەر فەرمانەکەی جێبەجێ کرابایە حەفتا جار پەشیمانی بۆخوا دەکێشا، ئەگەر نەشکرابایە دەجار پەشیمان دەبۆوە«الحمد الله»ی دەگوتەوە و شتێکیشی دەبەخشییەوە.

مراد لەبەرەو کۆتایی دەفتەرەکەی باسی کۆچی دوایی حەماغا دەکات و وای بۆچووە کە لە ساڵی 1922 یان 1923 بووە، لەمەشدا بە سەهوو چووە، چونکە وەک لەجێی خۆیدا باسم کرد هەم بەپێی نووسینی کابتن های و هەم بەو نیوە دێڕە شێعرەی باوکم کە بەئەژماری ئەبجەد مێژووی مەرگی دەرهێناوە مەرگی حەماغا لە 1920 بوو.

تا ئێرە هەموو ئەو باسانەی سەر بە حەماغا کە لە دەفتەرەکانی کاک حاجی محەیدین و کاک مراد دیباردا شیاوی گێڕانەوە بن بەخوێنەر گەیەندرا. بەشێک لەو باسانە پێشتر خۆم بیستبوومن بەشێکیشی بەتازەیی خوێندمنەوە. ئەو شتانەی لەزاری کوێخا حەویزەوە بڵاو بوونەتەوە ئەگەر زۆریش خۆشەویستی حەماغایان تێدابێ هەر جێی متمانەن، چونکە کوێخا ڕۆژگارێکی درێژی لەگەڵ حەماغادا ڕابوواردووە و زیرەکانەش بەرەو ناسینی حەماغاوە چووە. وورده هەواڵی دیکە لەبارەی حەماغاوە زۆرن، بەڵام باری کۆمەڵایەتیی کوردەواری لەبەر گەلێک هۆی وەک شەرمی حزوور و تێبینی زامداربوونی هەستی ئەم و ئەو ڕێی نەدام قەڵەمیان لێبگێڕم لەبری ئەوان وەک لەتیفەی

که لە دیوەخانەی حەماغادا ڕوویدابێت چەند ڕووداوێکی کورتیلە دەنووسم، که لە باوکم و دەوروپشتی خۆمانم بیستوون.

حەماغا بانگهێشتنێکی گەورەپیاوانی کۆیێ بۆ نانی ئێوارە دەکات، لە نێوانیاندا قائیممەقامێکی تورکی نوێ کە شارەزای حاڵ و باری وڵات نەبوو. کە مەلا بانگی ئێوارە دەدات و لێ دەبێتەوە خەڵقەکە تێکڕا هەڵدەستن بۆ نوێژ، قائیممەقام بە عومری خۆی نەیزانیوە و نەیدیتووە جەماعەت چییە و چۆنە. لە هەڵستانی تێکڕای ئەو عالەموڵڵایە نەختێک دەشێوێ و لەو کابرایە دەپرسێ کە بۆ شارەزایی لەگەڵیدا بووە چ قەوماوە؟ پێی دەڵێ هیچ نەبووە، خەڵقەکە بۆ نوێژ ڕاست بوونەتەوە. گوتبووی ئنجا ئەمن چبکەم؟ پێی دەڵێ وەک ئەوان لەڕیز ڕاوەستە چۆنیان کرد تۆش وەها بکە. ئەو ئێوارەیە قائیممەقام بەو جۆرە ڕزگاربوو. چەند ڕۆژێکی بەسەردا تێدەپەڕی حاجی ئەسعەداغا داوەتێکی نیوە ڕۆژەی خەڵقەکە دەکات. کە بە قائیممەقام دەڵێن بۆ نیوەڕۆژە لە ماڵی حاجی ئەسعەداغا داوەت کراوی. ترسی ئێوارەی ماڵی حەماغای بە بیردێتەوە بە ئاشناکەی خۆی دەڵێ، دیسان ئەو قیامەتەی تێدایە؟ ئەویش دڵی ئارام دەکات و تێی دەگەیەنێ کە دەتوانێ وەها ڕابنوێنێ بەر لە چوون بۆ داوەتەکە نوێژی کردووە... ئیتر ئەلحمدو لیللا... ئەلحمدولیللای لەسەر دەکێشێ و بۆ داوەتەکە دەچێ.

کاکەزیاد بۆی باس کردم جارێکیان مەلاعەبدوڵڵای نازەنینی کە مەلایەکی چاک و زێدە مسڵمان و قسە لە ڕوو بووە چۆتە دیوەخانەی حەماغا. لەو قەرەباڵغیەدا دەڵێ حەماغا بیستوومە برازایەکت قادر ناو لە خدران داناوە زوڵم لە عالەم دەکا پێی بڵێ با واز لەو زوڵمە بێنێ. ڕێکەوت وەهابووە کە قادراغا لەو دەمەدا لە دیوەخانە حازر بووە حەماغا پێی دەڵێ، قادر ئەوەتە لێرەیە خۆت پێی بڵێ. مەلاعەبدوڵڵاش دەڵێ بەخوای چاک بوو لێرە بوو، قسەکەم نەبووە غەیبەت. ئنجا ڕوو لە قادراغا دەکات و چی مەبەستی بوو پێی گوت، بەڵام بەسەرەخۆی ناهێنێ و ڕێزی دەگرێت. کە چووشەوە خدران دیارییەکی باشی بۆ مامۆستا هەنارد.

ڕۆژێکی هەینی باپیرم، مامم و بابمی لەخزمەتدا دەبن بەعادەتی خۆی دەچێتە دیوەخانی حەماغا. بابم و مامم دەیانگێڕایەوە ئەو ڕۆژە ڕەشیداغای حەوێزی، خاڵی باوکم بوو، مەلا لامیع کە پیاوێکی قسەزان و نوکتەباز بووە هەردووکیان لای حەماغا بوون، خەڵقی دیکەش بە زۆری. ئەحمەد عیززەتێکی ئیمامی تابووریش «طابووریش» ئەو ڕۆژە لە دیوەخانە بووە. مەلا لامیع و ئەحمەد عیززەت هەردووکیان حەزیان لە قسە دەکرد، بەڵام ئەحمەد عیززەت ڕێی مەلا لامیع نادا قسان بکات. مەلا لامیع دەقرقرێ و مەفەرێشی نییە قسە بکات. حاجی مەلاعەبدوڵڵا دەزانێ مەلا لامیع پڕی زگی قسەیە و سەغڵەت بووە و بێچارەیشە، لێی دەپرسێ تۆ لەو بەینە لە کەرکووک هاتیتەوە ئایا فلانە ئاش ئێستا دەگەڕێ؟ ڕەشیداغاش کە پیاوێکی زۆر زیرەک و هوشیار و قسەزان بووە تێدەگا حاجی مەلاعەبدوڵڵا مەبەستی چییە، لەجیاتی مەلا لامیع بەدەنگ دێ دەڵێ، ئەگەر ئاشەکە تێچینە باراشی بەربکەوێ بۆ ناگەڕێ. مەلا لامیع لە مەبەستیان دەگات و ڕوودەکاتە ئەحمەد عیززەت و پێی دەڵێ، هەناسەت بڕیم هەی هەناسەت بڕێ، تێچینە باراشەکم دەیێ هەی تێچینت بڕێ. ئنجا خوێنەر بۆ خۆی بزانێ چلۆن قاقای پێکەنین لەو مەجلیسە هەڵستاوە.

بیستوومە و بۆشم نووسراوە، کە حەماغا لە بەندیخانەی بەغدا بەر دەدرێ بەجلکی شڕەوە دەچێتە لای سەرتاشێک بۆ سەروڕیش تاشین. سەرتاش لە جلکوبەرگی ڕانابینێ پارەی لێ هەڵوەرێ بەڕێی دەکا. سەرتاشی دووەم و سێیەم و زیاتریش هەروەها تا دەگاتە یەکێکی «ابن حلال» سەر و ڕیشەکەی دەتاشێ. حەماغا کیسە پارە دەردەهێنێ و نخوونی دەکاتەوە چەندی تێیدابوو کردییە کرێی سەرتاشین و دای بەو سەرتاشە کە خەبەر بەنێو سەرتاشاندا بڵاو بۆوە، ئەوسا سەرتاشەکانی زووتر چووبوە لایان دەستی خۆیان دەشکاندەوە. دوای بەسەرچوونی ئەو 15 ساڵەی لە بەندیخانەی بەغدای ڕابوارد حەماغا بە خۆی و کۆمەڵە کەسانێکی لە گەڵیدا بوون هاتنەوە کۆیێ و کەوتەوە سەر باری جارانی لە بەخشندەیی و بووردن و

جەبدان و بەهاناهاتن. لە کژێکی چەڵتووک نەقڵکردندا یەکێک لە قەتارچییەکانی دوو فەردە چەڵتووک بۆخۆی لادەدات. قەتارچییەکانی دیکە پێدەزانن خەبەری حەماغای لێ دەدەن، حەماغا چەند ڕۆژێکان قسەکەیان لێ ناسەلمێنێ تاکوو لە ئاکامدا پییان دەڵێ ئەگەر ڕاست دەکەن لە کاروانی سبەینێدا دزییەکەم بۆ بەسەر بگرنەوە و بارە چەڵتووکی نوقسانم بۆ بە ئیسپات بگەیەنن. دەڵێن زۆر باشە. حەماغا بێئاگای ئەو قەتارچییانە بە کابرای دز دەڵێ، هەرامە چیدی بارە چەڵتووک لامەدە، قەتارچییەکان لێت بەئاگان کە دزی دەکەی، وازبهێنە. کابرا، چاروناچار، واز لەپیشەکەی دەهێنێ و چەندی قەتارچییەکان خۆی لێ دادەنووسێنن هیچی لێ بەسەر ناگرنەوە. حەماغا پێیان دەڵێتەوە بەخۆڕایی بوختانتان بەو فەقیرە دەکرد.

مام شاکر ناوێکی «وابزانم هەولێری» جەڵەبە کاووڕێک لە حەماغا دەکڕێ. بەڵام پارەی لە دەستدا نەبوو چاوەنۆڕ بوو لە هەولێرەوە پارەی بۆبێت و مۆڵەتی دووڕۆژی خواست. مام شاکر دەڵێ، من هاتمە دەرێ لەلای حەماغا کۆمەڵێک جوولەکە چوونە لای بۆ کڕینی ئەو کاوڕانە، منیش گەرامەوە بزانم چییان پێدەڵێ، کە دیتمی بەجووەکانی گوت ئەوەتە خاوەن کاوڕ لە خۆی بکڕن من دەخلێکم بەسەر کاوڕانەوە نەماوە چەندیش قازانج دەدەن ئەو خاوەنیەتی. دوای 3- 4 ڕۆژ پارەم بۆهات و بردمە لای حەماغا. گوتی پارەت هەڵگرەوە، کەنگێ جەڵەبت بردە حەڵەب و فرۆشتت و پارەکەیت وەرگرت ئەوسا کە هاتیتەوە بە سەلامەتی پارەت لێوەردەگرم. پارەیەکی پێتە مامڵەتی دیکەی پێبکە.

ئەم باسەیان کە خەریکم بە ئیزنی گیانی حەماغا بیگێڕمەوە بەڵگەیەکی زێدە زێدە گەورەیە لەسەر لێبووردوویی و چاوپۆشی حەماغا کە قسە نەستەقەکەی کۆنینەم بەبیردا دەهێنێتەوە کە دەڵێ، لە گچکان خەتا لە گەوران عەتا.

سبەینەکی سارد حەماغا بۆ خۆشووشتن. وابزانم چۆتە ئەو حەمامەی نزیک ماڵیانەوە کە حەمامی حەساناغای پێگوتراوە و هی برای خۆی بوو «ئێستاش

ئەو حەمامە ماوە». پێشتر کۆمەڵەک لە جحێڵی هەرزەکار چوو بوونە حەمامەکە و پتر لەوەی بە خۆشووشتنەوە خەریک بن غەرقی دەستبازی و شەق شەقانێ بوون. حەماغا بە تاریکایی ڕاڕەودا دەڕوا بۆ ژووری حەمام یەکێک لەو جحێڵانە بە برادەرێکی خۆی تێدەگا و ئەوەی لەگەڵدا دەکات کە لەگەڵ برادەرەکەی دەیکرد. کە زانی سەهووی کردووەو لە حەماغا بە هەڵەدا چووە وەک مردووی لێبەسەردێت و لەشەرم و بەخۆدا شکانەوەو لەترسان بەلێوە لەرزە بەرەو ماڵ ڕادەکات. حەماغا کە گەڕایەوە بۆ دیوەخانە بەدوا ئەو جحێڵەدا دەنێرێ. لە خزم و کەسی دەبێتە مەترسی و گریان، ئاخۆ چ لەو بەدبەختە بکەن. کە کوڕەکە دەگاتە لای حەماغا ووشک هەڵگەرابوو. حەماغا دڵی دەداتەوە و پێی دەڵێ تۆ چ سووچت نییە منت نەناسیوە جێگاکە تاریک بوو دڵت نەشێوێ. کورتەکێکی بەخەڵات دەداتێ و چەند لیرەیەکیشی لەدەستی دەنێت و بۆ ماڵی خۆی دەنێرێتەوە.

ڕێکەوەت وەهابوو شەوی کە دێڕەکانی سەرەوەم تێدا نووسی بۆ سبەینێ بە بۆنەی تێپەڕینی ساڵێک بەسەر مەرگی مامۆستا عەلائەدین سەجادیدا چوومە ماڵەکەی، کۆمەڵێکی قەرەباڵغ لە خاوەن ناوو قەڵەمی کوردی بەغدا بەشداری ئەو داوەت و کۆبوونەوە بوون. لە وەڵامی پرسیاردا گوتم خەریکی نووسینم لەبارەی حەماغای کۆیەوە. برادەرانی دەوروپشتم، وەکوو مامۆستا مەلامحەممەدی کوڕی مامۆستا مەلاتەهای بالیسانی و مامۆستا عەبدولخالق قوتب و مامۆستا ئیحسان شێرزاد ئەشهەدوویان کێشا لەسەر پەسندی کارەکە و لەسەر گەورەیی حەماغا لە نێوان قساندا مامۆستا عەبدولخالق گوتی ساڵی 1946 بۆ بەسرە نەقڵ بووم بە «معلم»، خۆم لەدیوەخانەی عەبدولقادر باش ئەعیان کە یەکێک بوو لە گەورەپیاو و گەورەی بنەماڵەیەکی مەشووری بەسرە بیستم لێیان مەدحی پیاوەتی و سەخاوەت و مەردایەتی حەماغای کۆیەیان دەکرد. ئەو دەمە پتر لە 25 ساڵ بەسەر مردنی حەماغادا تێپەڕی بوو بێگومان بەشێکی ئەو مەدحە دەچێتەوە بۆ

ڕەفتار و کرداری حەماغا لە حەبسخانەی بەغدادا کە ساڵەهای تێدا مایەوە و ڕوستەمانە و حاتەمانەی ڕابوارد.

هەر لەو داوەتەدا و بەدوا قسەکەی مامۆستا عەبدولخالقدا مامۆستا مەلامحەممەدی بالیسانیش شتێکی لەباری حەماغاوە گێڕایەوە کە وا لەدەمی کچ بەمێرددانداندا بۆ ئەوەی نیکاحەکە دروست بێ پێویستە حەماغا بچێتە سەر مەزهەبی حەنەفی، چونکە مەرجەکانی وەلی بۆ ئەم تەرزە حاڵانە لە مەزهەبی شافیعی سەختن و ڕەنگە هەر نەیەنەجێ، خەڵق مەجبوورە تەقلیدی مەزهەبێکی ئاسانتر بکات. حەماغا قسەیەکی کردبوو هەر لەو دەوەشایەوە، گوتبووی ئەمن چ عەیبم لەشافیعی نەدیتییە، هەتا پێی ڕازی نەبم. بەخوا مەزهەبی خۆم ناگۆرم. لەوە بەولاوە نازانم گرفتەکە چۆن چارەکراوە.

کۆیی دەگێڕنەوە، حەماغا کە لەحەبسی بەغدادا بووە بۆ خاتری دەردەست کردنی ماست و شیر کە زۆری پێئاشنابوو چەند ئاژەڵێکی وورد و گەورەی کڕیبوو دابووی بەیەکێکی بەغدایی کە خۆیشی لێیان بخوات و ئەویش بێماست و شیر نەکا. ساڵەهای ساڵ دواتر گۆیا جەماعەتێکی کورد بەرەو بەغدا لەو چۆلستانەی پێی دەڵێی چۆلی قرفە یان بەولاترەوە تووشی ڕەشماڵێکی گەورەی بەماڵ وحاڵ دەبن، لادەدەن بۆ حەسانەوەیەک و قومەئاوێک. خاوەن ماڵ کە دەزانێ کوردن بەخێریان دەهێنێت و خزمەتیان دەکات و پێیان دەڵێت ماڵی من بۆ ئێوە بێمنەتە، چونکە ماڵی خۆتانە. کوردەکان تێناگەن بۆچی دەبێ لەو دەشتە کاکی بەکاکیە ئەو هەموو مەڕوماڵە هی ئەوان بێت. کابرای عارەب پێیان دەڵێ ئەمەی دەیبینن هەمووی لە مانگا و مەڕی حەماغا کەوتۆتەوە کە لە حەبسخانەی کڕیبوونی بۆ ماست و شیر دوای بەربوونیشی بۆ خۆمی بەجێهێشتن ئنجا ئەگەر دەیناسن سابزانن هەموو ماڵی من هی ئەوە. لەناوی عەرەبەوە ئەم بەیتەم بەبیردا دێتەوە لە لاواندنەوەی گەورە پیاوێکی عەڕەبی سەردەمی عەباسییان:

فتى عيش في معروفه بعد موته

كما كان بعد السيل مجراه مرتعا

واتە: مەردێکە دوای مەرغی خەڵق لە چاکەیدا دەژین.

هەر وەک دوای سێڵاو گیای سەوز لە ئاوەڕۆگەیدا دەڕوێ.

حەماغا! تۆ و کۆیە لە کوێ و بەغدا و بەندیخانەی لەکوێ و عەrەب و قافڵەی کوردان لە کوێ!!

خالدا گرنیستی دیوانە و صحرانورد

توکجا و کابل و غزنین و خاک قندهار!!

لێم مەگرن، بەدەست خۆم نییە مولانا و حەماغام بە دوو «دیوانە» دێنە بەرچاو هەر یەکە لە دەروویەکی مەردایەتییەوە.

جارێکیان حەماغا لە جەژنەدا بەسەردانی خاوەن دیوەخانەکانەوە خەریک بووە، قەرەباڵغێکی ئەستووری بەدوادا ڕۆیشتووە. لەکۆڵانەیەک دەگاتە ئافرەتێکی پیر. بەسەردار عەساوە بۆی ڕادەوەستێ و دوورودرێژ لە ئەحواڵی دەپرسێ و دڵدانەوەی دەکا. لێی دەپرسن ئەو ئافرەتە کێیە وەها بۆی بە پەرۆشە. گوتووی لە بیتوێن مەتبەخچیم بووە خزمەتی کردووم، لە دەمی داچاندنی مەرەزە و لە قۆناغی خەرمانی چەڵتووک نان و چێشتی بۆ دروست کردووم چاکەی هەیە بەسەرمەوە. ئەم قسەیەم لە فەتاحاغای عەولاغای حەوێزی بیست.

بەبۆنەی هاتنە ناو جەژن و بەسەرکردنەوەی یەکدی لەو ڕۆژە پیرۆزانەدا باسێکی کورتیلە دەگێڕمەوە کە لە باوکم بیستووە و پێوەندی بەحەماغاوە هەیە.

باوکم گوتی، جەژنەیەکیان حاجی مەلاعەبدوڵڵا ناساغ بوو نەیتوانی بچێتەوە بۆ لای ئەو کەسانەی کە لە جەژنەدا دادەنیشن و خەڵق بۆ جەژنە

پیرۆزانەیان دەچوو «ڕۆژی یەکەم دەهاتنە لای باپیرم، بەدوا ئەودا لای باوکم. ڕۆژی دووەم باپیرم، بەدوا ئەودا باوکیشم، دەچوونەوە لای خاوەن قوناغەکان. ڕۆژی سێیەم دەچوونەوە بۆلای شێخەکان و مەلاکان و هەندێک لەو توجارانەی لە جەژنەدا دیوەخانیان دەکردەوە». لەجیاتی خۆی حاجی مەلا ئەحمەدی مامی «واتە مامی باوکم» هەنارد بۆ سەرلێدانی ئەوکەسانە. باوکم گوتی منیش مێردمنداڵەبووم لەخزمەت ماممدا بەشداری ئەو گەڕانە بووم. لە دوو کۆڵانەی جوداوە تاقمی ئێمە و تاقمی حەماغا گەییشتینەوە یەکتر و ڕووشمان لەیەک جێگا بوو. حەماغا و حاجی مەلا ئەحمەد بۆ سڵاو و چاکوچۆنی ڕاوەستان قەرەباڵغیش بەدوایانەوە مۆنجەی دا، کە هاتین بەڕێ بکەوینەوە حاجی مەلا ئەحمەد پێی چەقاند، چونکە پێش حەماغا نەدەکەوتەوە. حەماغا ڕووی تێکردم گوتی کاک حەمەد پێش کەوە. گوتم ئاغا ناشێ پێش جەنابت و مامم بکەومەوە. حەماغا هەنگاوی هەڵێنا و قۆڵی گرتم و پێشی خستم گوتی، شوونی خۆتە پێشم کەوە. ناچار بەو منداڵییەوە بوومە پێشڕۆی ئەو هەموو حەشاماتە...

کە هەر باس گەییشتە ئێرەکانە ئەوەندەش دەخەمە سەر قسەکانم کە دوای حەماغا، جەمیلاغا بوو بە پێشڕۆی ئاغاکان. زۆرجار دیتوومە لە داوەت و جەژنە و تازیاندا جەمیلاغا مامی پێش خۆی دەخستەوە لەو جارانەدا کە باوکم نەیدەتوانی بەشداری ئەو موناسەبانە بکات. جاران خەڵق بۆ لایەنی ڕێزلێنان و پایە دیاریکردن پتر لە پەرۆشی ئەوەدا بوون کەوا هەر کەسە پلەی خۆی بزانێت و پێشی ڕازی بێت. ئێستا کە لە ڕوواڵەتدا دەگوترێ پاش و پێش نەماوە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوی دەسەڵاتی تازەی پەیدا کردبێ باری سەرەوە و پێشەوە بەخۆی ڕەوا دەبینێ، کەسیش سەرپێچی لێ ناکات. وەی کاشکی هەرچی ڕەسمییاتی جیهان هەیە هەمووی پێچرابایەوە و کۆت و زنجیری داب و دەستووری هەناسەبڕ و جوداکەرەوە وردوخاش کرابانایە و لە ناز و فیز و لە خۆبەکەم زانین ڕزگار بووینایە. دەبڵێن ئامین...

وەها دەبێ چاکە ڕوو لە گەپ دەکات و هەر خێری نوکتەی پێوە دەمێنێ. لەم بابەتە، جارێکیان حەماغا بەناو بازاڕدا تێدەپەڕێ مچەی حەوێز بابایەک بووە هەر لەم قسانەدا خۆیمان پێدەناسێنێ، پێشی پێدەگرێت و داوای یارمەتی لێ دەکات. حەماغا پێی دەڵێ، مچە، پارەت نادەمێ چونکە، بەعەرەقی دەدەی ئاخر عەرەق حەرامە. پێی دەڵێتەوە ئاغا پارەکەم بدەیێ شەرتی پیاوان بێ ئەم جارەیان بەروحی مێووژی بدەم حەماغا پێدەکەنێت و بەتاقمی خۆی دەڵێ پارەی بدەنێ.

لەوانەیە ڕووداو چ نوکتە بێ چ چاکە چ خراپە پێشتر لە کۆنەوە قەوما بێ، دواتریش لە ڕۆژگار و وڵاتێکی دیکە ڕوویدابێتەوە. دەمەوێ بڵێم مەرج نییە هەبوونی باسێکی کۆن لە بابەتێکی کە وەپاڵ ڕۆژگارێکی دواتر دەدرێت بەڵگە بێ لەسەر درۆبوونی باسەکەی دواتر. بەنموونە دەڵێم، ئەو حیکایەتە نوکتە ئامێزەی کە لە ڕەزابەگی مەشووری دەگێڕنەوە گۆیا گوتبێتی، دووسەگی دڕم هەبوو، زنجیریان پساند و بەشەڕ هاتن تا خەڵقیان پێگەییشت یەکتریان خواردبوو، لە نەختێک تووک و کلک بەولاوە هیچیان لێ نەمابۆوە، ئا ئەم حیکایەتەم خوێندۆتەوە لە کتێبێکی فارسی بێ ئەوەی ئاگای لە ڕەزابەگ بێت حیکایەتەکە دەداتەوە بە حەفتسەدساڵ لەمەوبەر و قەزوینیشی بەمەفتەن بۆ دادەنێ. ئنجا ئەگەر بەر لە مچەی حەوێز کەسێک بە نامەی ڕۆحی مێووژ پارەی بۆ عەرەق کڕین لە خێرخواهێک یان سەخی تەبیاتێک وەرگرتبێ گومان لە باسەکەی مچەی حەوێز پەیدا ناکات، چونکە لەوانەیە باسە کۆنەکەی بیستبێت و بۆ خۆی بەکاری هێنابێ یاخود قسەکەی بۆ هاتبێ بێ ئەوەی لە کەسی بیستبێت. مەسەلەکەی ڕەزابەگیش لەوانەیە بۆیان هەڵبەستبێ و لەوانەیشە لە دەمی خۆیەوە دەرچووبێ. بنگەی باوەڕکردن بەگێڕانەوەی باسی دەماودەم دەچێتەوە بۆ ئاکاری ئەو کەسەی هەوەڵ جار باسەکەی گێڕاوەتەوە تا ئەگەر بابایەک بووبێ متمانە بە قسەی کرابێ دەبێتە جێگەی باوەڕپێکردن چەندا وەکوو پێشتریش باسی ئەوتۆیی هەبووبێ. ئەم

عەیارەیە بۆ مچە حەویز و بۆ غەیری ئەویش و غەیری ڕەزابەگیش ڕاستی و هەڵبەستراوی قسان ساغ دەکاتەوە.

لەمەیدانی شیعر بکۆڵێتەوە تووشی گەلێک نموونەی نازداری بریسکەداری ئەوتۆ دێیت دڵت بۆ خۆی دەدزێتەوە دواتر لە پەنا و پەسێوی کتێبی نابەرچاو یان پەڕپووتی چەند سەدساڵەیی دەخوێنیتەوە شاعیرێکی دیکە بە زمانێکی دیکە لەو واتایە و لەو نوکتەیە شێعری هەڵبەستووە.

ئنجا هەروەک دەشێ شاعیری دووەمیش وەکوو خۆت چاوی بە نموونە کۆنینەکەی کەوتبێ هەروەهاش مومکینە لەخۆوە بۆ ئەو واتایە چووبێ. وەها بووە لە مەیدانی زانستدا دوو زانا بێ ئەوەی ئاگایان لەیەکتر بووبێ ڕاستییەکی نهێنییان دۆزیوەتەوە. ئەو قسانەی لێرەدا لە حەماغای دەگێڕمەوە نە لەو زیادن، نە ئەو کەسانەی لێیانەوە نەقڵ دەکەم چ مەبەستیان هەیە بۆ هەڵبەستنی شتی ڕوونەداو، زۆربەی هەرە زۆری ئەو خەبەرانش لەوانەن پێشتر لە خەڵقی دیکەم بیستوون بەڵام ئەگەر بۆیان باس نەکردابامەوە بە بیرمدا نەدەهاتنەوە. وادەبێ یەک خەبەر لە دوو کەسەوە بە دوو جۆر دەگێڕدرێتەوە، ئەمەش دیاردەیەکە بەدرێژایی ڕۆژگار بەرچاو بووە. ئەگەر لە دەم و ئارداوێژی خەبەرگێڕەوە تامی دوژمنایەتی یان لایەنگیری نەیەت لەوانەیە هۆی جوداوازی دوو خەبەرەکە بچێتەوە بۆ لەبیرکردنیان بە سەهوو چوون، وەهاش دەبێ هۆیەکی سایکۆلۆجی لە گۆڕانی باس و خاس بەشدار دەبێ وەک کە لە نووسینەکانی «فرۆید» دەخوێنیتەوە کە وا زۆر جاران مرۆڤ شتێک دەبیسێ کە بە تەمایەتی یان حەزی پێدەکات یان لێی ناڕازییە کەچی ئەوەی بە ڕاستی بیستوویەتی شتێکی دیکە بووە. بەنموونە دەڵێم، لەوانەیە کابرایەک بە تەما بێ برادەری یان کوڕی داوای ماینە بۆرەی لێ بکا بۆ سەفەر کەچی داواخواز ناوی ئێسترەماچە دەهێنێ، بەڵام کابرا بەڕاستی وەها دەزانێ ماینە بۆرەی لێ داوا کراوە. یان خۆت لەبەر ناحەزی و گومانی بەد لە ناحەز کردن وەها دێتە بەر قەناعەتت کە فڵانە کاری نامەردانە هی دوژمنەکەتە، ئنجا زۆر لە گوینەکە بابایەک ئەو کارەی وەپاڵ یەکێکی

دیکە دا، تۆ هەروەها بزانیت کە دوژمنەکەتی نامزەد کردووە. من ئەم دیاردەیەی بە سەهوو چوون لە «ناو و جێگە و کات»م لەخۆمدا هەست پێدەکرد نەشم دەزانی بۆچی وەها بەسەهوو دەچم هەتا نووسینەکەی فرۆیدم خوێندەوە. هەر لەم بووارەوە دەزانم کە سەهووی کەسانی دیکەش لەو شتانەی بە ئانقەست نین و مەبەستی نهێنییان تێدا نییە دەچێتەوە بۆ هۆیەکی بە هەڵەبەری ئەوتۆیی. وەها ڕوویداوە کەسێک ئیستیکانە چایەی لەپێشم داناوە، لەدڵدا بەتەمابووە پێی بڵێم ڕەنگی زیاد بکە کەچی گوتوومە شەکری دیکەی تێکە، ئەو کەسە خەیاڵەکەی خۆی بە بەر گوێدا هاتووەو لە ڕەنگی چایەکەی زیادکردووە.

ئەمانە دەڵێم بۆ ڕوونکردنەوەی لایەنی ئەو ئیحتمالەی کەوا دەشێ خوێنەر خەبەرێک و پتریش لە خەبەرێک لەم نووسینەدا بخوێنێتەوە کە پێشتر بەجۆرێکی دیکەی بیستووە جوداوازی دەقی خەبەر نابێتە بەڵگەی درۆ بوونی. بە ئەزموون و تاقیکردنەوە،خۆت باسێک بنووسە و هەڵی بگرە هەتا ساڵێک ئنجا سەرلەنوێ بێ ئەوەی سەیری نووسینەکەت بکەیت جارێکی دیکەش بینووسەوە و بە یەکتریان بگرە بزانە چەند لەیەکدی دوور کەوتوونەوە.

خوێنەری بەڕێز، باسی سەخاوەت و پیاوەتی حەماغا شتێک نییە لە نێوان کوردەواریدا لزومی هەبێ بە هەوڵدان بۆ چەسپاندنی لە مێشکاندا، چونکە گەلێک بەولای سەخاوەتی حاتەمەوە بە کوردەواریدا تەشەنەی کردووە، خۆ ئەگەر کورد بەدرێژایی ڕۆژگار ئەو پەک کەوتەیە نەبوایە کە هەیەو بیتوانیبایە وەکوو میللەتانی دیکە جوانمەردیی مێرخاسەکانی لە دەفتەرخانەی مێژوودا بپارێزێ، ئەوسا هەروەک زاخاوی مێشکی خۆی دەدا بە خوێندنەوەی نوکتەی ناو گۆڤار و ڕۆژنامەی غەیری کوردی یان ئازایی و پیاوەتی نیمچە پاڵەوانی سەخاوەتی بێگانە لە کتێبی شیک و قەشەنگدا بە بەرچاوی خۆیدا تێدەپەڕێنێ، ئا ئەو کوردە ڕێی دەبوو ناوناوە سەرێکیش بە کردەوە و ڕەفتاری ئەو خانە شێواوانەی کورددا بگرێت کە نان و زەوادێکی بە چەنگەچڕەیان پەیدا کردووە لەدەمی خۆیانیان گێڕاوەتەوە بۆ

دەمی هەژار و برسی و میوان و ڕێبوار. بەڵام گەلی بێدەفتەر هەر ئەوەندە یادی بەسەرچووان دەکاتەوە کە ناویان بەسەر زماندا دێت و کرداریان لە پەڕەی مێشک چریسکە دەکات، زمان و مێشکیش پەڕی کتێب نین بمێنن تا ئەگەر مشکیش نەختێکی لێ بقرتێنێ نەختێکی لێ ڕزگار دەبێت. بێگومان ئەگەر کورد لەوانەبایە دەفتەری هەبێ، حاڵ و بار و دارایی و سامانێکی ئەوتۆشی دەبوو وەکوو میللەتانی خاوەن دەفتەر چاوی ڕابێ لە خوێندنەوەی ناوی ناودارانی و پێی ئەبڵەق نەبێ وەک کەسێکی کە خۆراکی لە ماڵی خۆی شک برد بەخیلی نابا بە کەسێکی دیکەی وەکوو ئەو خۆراکی هەبێ. بەڵام لە سەر ساجی عەلی و لە ژێر ڕێکاری ئیفلاسەوە مرۆی ئێمەمانانی چاوبرسی لەدەنگی زرینگەی درهەم بەدەستی بەقاڵەوە دەسڵەمێتەوە... لە ناوی مەزنە پیاوان فێ دەیگرێ. سەیریش لەوەدایە ئەو تەرزە نەخۆشییە نەفسییە هەر لە ئاست خۆماندا شێت و هارمان دەکات، ڕەنگە زات نەکەین ناو و شۆرەت و دارایی لە بێگانە بەزیاد بگرین. ئنجا لێرەدا قسەیەکی مەحرەمانەم هەیە لەگەڵ گەنجی بەهەڵەدا چووی کورددا. گەنجێکی وەتەنگ بێ لە چاکەی براگەورەیەکی کورد لەگەڵ میللەتەکەیدا کردبێتی. دەبێ دەجاران وەتەنگتر بێ کە ببینێ بێگانە دان بە مافێکیدا دەهێنێ. دەبێ ئاواتەخواز بێ کە دوژمنەکەی پتری لێ بکوژێت و لێی وێران بکات. دەبێ ئەگەر خرایە بەندیخانەوە لەزەت لەزێدە عەزابدان و قورستر کردنی کۆتەکانی وەربگرێ. دەبێ ئەگەر لەبێگانەوە عەفوێکی بۆهات خۆی بکوژێت چونکە بەو عەیارەیەی کەمەردایەتی سەید ئەحمەدی خانەقا و حەماغای پێ ڕەفرز دەکات هەر چاکە و چاوپۆشییەکی لە داگیرکەرەوە پێی گەییشت بەڵگەی خیانەتی پاتەوپاتی بێت. گەنجی چەپڕۆ دەبی بابداتەوە سەر پەیمانی دۆستانەی نێوان یەکیەتی سۆڤیەت و دەوڵەتە ئیمپیریالیستەکان لە شەڕی دووەمی جیهانیدا و زۆرزۆر تووڕە بێ بەوەدا کە ئەو دەوڵەتانە نەبوونە لایەنگیری ئەڵمانیای نازی، چونکە بە عەیارەی ئەو چەپڕۆیە دۆستایەتی کردنی ئیستعمار لەگەڵ غەیری خۆیدا بەڵگەی بەدایەتی و ناپەسەندایەتی و

خوێنمژایەتی ئەو غەیرەیە خۆ ئەگەر پاشگەز بێتەوە لە عەیارەی خۆی بەرانبەر ئیستعمار و یەکیەتی سۆڤیەت چ بەهانەی بەدەستەوە نامێنێ لە وەتەنگ هاتن بەرانبەر کردەوەو ڕەفتاری مەردانەی دەرەبەگێکی کورد. چ قەیدێ دەکات دەرەبەگ لەگەڵ میللەتەکەی چاکەی کردبێ و میللەتەکەی چاکەی دەرەبەگی قەبووڵ کردبێ هەروەک یەکیەتی سۆڤیەت چاکەی ئیستعماری هەڵگرتبێتەوە، خۆ نابێ بسەلمێنین «بانێکەو دوو هەوا»!! بەڵام ڕاستییەکەی «بانێکەو دەهەوا»..

هەژاری و لێقەوماوی و بێدەسەلاتی و کەنەفتی کە درێژەی کێشا مێشکی ئادەمی لەق دەکات و چاوی زەق دەکات و دڵی ڕەق دەکات تا ئەوەی ڕەنگە ئەو ئەنگوستە بکرۆژێ کە هەنگوین لە مەلاشۆی هەڵدەسوێ یاخود ئەو جەلادەی خۆش بوێت کە پەتەکەی مەحکەمتر بەدارەوە دەبەستێتەوە... ئێمە میللەتێکی بێدەفتەرین، نەقشی سەر ئاوین. حاجی قادر دەڵێ:

کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز<br>
بە کوردی گەر بنووسرایە زەمانی<br>
مەلا و مەحشەر دەما ناو و نیشانی

هەروا بەدەم ئاگری هەناوە هەڵایساوەکەی بۆ قەومی کورد قسە دێنێت و نایگێڕێتەوە هەتا دەگاتە ئەو مەڵبەندە:

بڵێ بەو سەر کزۆڵەی قوز پەرستە<br>
بەچاوی کلدراو و ڕیشی پانی<br>
کە نەفعێکت نەبوو بۆ مۆڵک و میللەت<br>
بەمن چی نەقشبەندی یا نەمانی<br>
کەسێ پیاوە کە دانێ وەک حەماغا<br>
لەبۆ ئەبنایی جینسی نان و خوانی<br>
وەیاخۆ وەک ئەميناغا بەهیممەت<br>
بکا بۆ قەسری میللەت پاسەوانی

تۆمارخانەی حاجی لێرەدا کە بە سەخاوەتی حەماغا و پەرۆشی ئەميناغادا هەڵدەڵێ و دەرسێکی دڵسۆزی بۆ میللەت و پەندێکی نیشتمانپەروەریمان فێر دەکا و بەوەدا لە ڕۆژگاری خۆیەوە بۆ ڕۆژانی دوایی مۆرکی تاوانبارکردن لەو کەسانەش دەدا کە چاکەی چاکەخوازانی میللەتەکەیان دەشارنەوە یاخود لێی وەتەنگ دێن، بێ ئەوەی بەدڵیدا هاتبێ هەر لە روحپاکی خۆیەوە شایەدیەکی نهێنی زێدە بەتین دەدات بۆ زێدە پیاوەتی حەماغا. حاجی کە مەدحی سەخاوەتی حەماغا دەکات لەو ڕۆژانەدا کە جارێ ئەميناغا بەرحەیات بووە لەناو توێژی شایەدیەکەیدا بە ڕاستییەکی گەورەمان دەگەیەنێ کە نەختێک لێوردبوونەوە وسەرنج لێگرتن دەری دەخات. ئەميناغا لە دەوروبەری ساڵی 1305 ک. دا مردووە، حەماغاش لە 1299 ک.دا حەبسخانەی بەغدای بەجێهێشتووە. ئنجا ئەگەر تێبینی ئەوە بکەین کە دەشێ ئەميناغا دووسێ ساڵی دیکەش دوای مەدحەکەی حاجی ژیا بێ دەمێنێتەوە ماوەی سێ ساڵێک لەنێوان بەربوونی حەماغا و ئەو مەدحەدا. بەو پێیە تێدەگەین حەماغا چ جوانمەردێک بووە کە لەو ماوە کورتەدا سەخاوەتێکی وەها زل ڕابنوێنێ دەنگ و ناوبانگی بگاتەوە ئەستەنبۆڵ و جێی خۆی لە شیعری حەقپەرستێکی وەکوو حاجیدا بکاتەوە. خۆ ئەگەر بڵێین لەوانەیە حاجی زووتر ئەو مەدحەی حەماغای کردبێ ئەوسا مەدحەکە دەچێتە رۆژانی بەندیخانەی بەغداوە کە ئیتر سەخاوەتەکە هەموو سنوورێک دەبەزێنێ بۆ ئەوەی لە چوار دیوارەی حەبسخانەی وڵاتی غەریبییە و باز بەسەر موستەحیلدا بهاوێژێ بەرەو چوارگۆشەی وڵات. ئەبو فراس حمدانی کەوتە دیلی و ئەسارەتی ڕۆمەکانەوە، لە حەماغاش دەوڵەمەندتر بوو کەچی لە کزە و پڕووزەی سەردوولکە بەخۆدا هەڵگوتنی تێنەپەڕاند. حەماغا شاعیر نەبوو تا بزانین چ جۆرە شیعرێکی هەڵدەبەست لە حەبسخانەدا بەڵام لە ئاکارییەوە دیارە فرمێسکی هەڵنەدەڕشت. ئەو لەژێر قەمچی و لێدانی جندرمەی عوسمانلی کە ئەسیریان کرد نەیگوت ئۆف دیارە لە گوشادی دەمی شیعر داناندا نەدەپڕووزایەوە.

نموونەی سەرەوە لە شیعری حاجی قادر باسی سەخاوەتی حەماغای کرد، قسەشمان لە سەخاوەتی بوو بۆیە ئەو نموونەیەم پێش خست. وەک دەزانین حاجی قادر جارێکی دیکەش لە هەڵبەستدا مەدحی ئەمیناغا و حەماغای کردووە:

دوو ئاغای ماوە وەک بیستوومە ئەخبار
ئەمیناغاو حەماغای ساحبی کار
ئەمین و پشتیوانی قەسری میللەت
نیگەهبانی خەزینەی مڵک و دەوڵەت
لەو دونیادا خودایە هەر بمێنن
بنەی بێ ئیتتیفاقی هەڵکەنێنن

ئەم هەڵبەستە لە هەموو ڕوویەکەوە جودایە لە نموونەی پێشوو، چ لە لایەن مەبەستی شیعرەوە بێ و چ لەلایەن شێوەیەوە بێ. نموونەی یەکەم «عەموودی»یە، ئەمەیان وەک مامۆستا گیو دەڵێ «جووت پاشبەند»ە. ئنجا چەندێکی بمانەوێ کاتی دانانی شیعرەکان بەلای ساڵی مردنی ئەمیناغاوە بهێنین هەر دەبێ دووساڵێک بخەینە نێوان نموونەی یەکەم و دووەمەوە، چونکە شاعیرێکی وەکوو حاجی قادر کە بەهەر چوار دەوری خۆیدا سەیر دەکات و لە حاڵ و باری کوردەواری دەجمێت و دەجووڵێت بەحاڵ لە ماوەی دووساڵدا ڕێی دەبێ دوو جاران بە حەماغا و ئەمیناغاوە خەریک بێت، واشدەزانم پەرۆشی بۆ «اتفاق» بای داوەتەوە سەر نموونەی دووەم، چونکە ئەو ئاواتەی لە نیوەدێڕی دوایینی شیعرەکەی هەڵکەندنی بنەی بێ ئیتتیفاقییە وەها ڕادەگەیەنێ کە باس و خواسێکی نارێکی نێوان غەفووری و حەوێزییانی پێگەییشتبێ ئەویش لە گۆشەی پەرۆش و خەفەتباری خۆیەوە ئەو سکاڵایەی بۆ بەرگوێی بیسەران هەڵدابێ.

بەکورتی و بە کوردی ئەم نموونانە شایەدی دەدەن لەسەر هێندی کە سەخاوەتی حەماغا دوای بەربوونی لە بەندیخانەی بەغدا بەماوەی دوو سێ

ساڵ ناوی دەرکردبێ تا ئەوەی لە ئەستەنبۆڵیش، لای کوردەکان، دەنگی دابێتەوە.

دەمێنێتەوە لە گۆشەیەکی نابەرچاوی گومانکارییەوە بگوترێ، کێ دەڵێ حاجی قادر مەدحی سەخاوەتی حەماغای نەکردووە بەرلەوەی بکەوێتە بەندیخانەوە؟ ئەم تێوەرێخە هیچ بایەخی نییە، چونکە بەر لە حەبسبوونی حەماغا، مەحموداغای باوکی براگەورە بووە و بەدڵی کەسدا نایەت ناوی بسڕێتەوە لەتەک ناوی کوڕەکەیدا. ئەگەر مەحمووداغا مابایە چۆن دەگوترا، دوو ئاغای ماوە...؟ هەرچۆنێک بەیتەکان هەڵسەنگێنین و بەهەر ڕوویەکیدا بخەین هەر دەگەین بەو ئاکامە کە هی سالآنی نێوان «1299 و 1305 ک» ن.

هەموو سەخاوەتی حەماغا لە دەستەیەکی تەرازوودا و هەڵوێستی بەرانبەر هەژار و مێوان و غەوارە لە گرانیەکەی 1917ز. لەدەستەیەکدا، هێشتان بەلای دەستەی ساڵی گرانیدایە. تۆ چۆن بتوانی ئەوەندە سینە فەڕاح و باڵقووڵ بیت حەشامەتی برسییان بتخەنە ژێر پێیانەوە و زوێر نەبیت و نەشیەڵیت کەسیان لێ زوێر بێت. لە پشکووتنی ڕووناکی ڕۆژەوە هەتا داخرانی ئاسمانی شەوی تاریکی ئەو زستانە حەشاماتی دیوەخانە و ئاپۆرەی برسییان بەدەوری ماڵەکەیەوە زاریان داپچڕیوە بۆ بژێو، بژێویش لە فڕنی خانە و مەتبەخی ماڵەکەیەوە بۆ هەناوی ئەو عالەموڵلایە بەڕێ دەکرێ. مووچەی ڕۆژانەی مزگەوتی گەورە 100 نان بووە جگە لە خۆراک هەروەهاش مزگەوتەکانی دیکە هەر یەکە بەپێی قسنی سەر. حیسابی مەسرووفاتی ئەو ساڵەی گرانی لەماڵ و دیوەخانە و هەناردەی حەماغا نە دەفتەری بۆگیراوەتەوە نە بەکەسیش دەکرا دەفتەری بۆ بگرێتەوە. ئاشێک بهێنە بەرچاوی خۆت کە 24 سەعات لە گەڕدا بێت و بە هەموو لادا نان و خۆراک بەڕێ بکات بۆ ئەوانەی کە زۆربەیان ناناسرێن، حەماغاش دابنێ بە قۆنتەراتچی کە نەیەڵێ ئاردی لێ ببڕێ ئنجا کە گەنم لەکۆیە نەما بنێرێ لە هەولێرەوە بۆی بێت، کە پارەی بڕاو ویستی بە فرۆشتنی کاوڕان پارەی دەغڵ پەیدا بکات، کاوڕەکان لە قەبەڵ خوا بکات و بۆ هەژارانیان سەر ببڕێ. مراد

لە کوێخا حەوێز دەگێڕێتەوە، منیش لەلای خۆمەوە بیستوومە حیسابی داهات و مەسرەفی حەماغا نەدەچوە سەر کاغەزەوە، چونکە ئەوەندەی لێ دەخورا و دەدزرا و بەملاو بەولادا پەرت و بڵاو دەبۆوە سەری میرزایانی تێدا سوڕدەما.
کوێخا حەوێز دەڵێ، بەرەکەت لە ماڵەکەیدا هەبوو کە کەلێنی ئەو هەموو لاخۆر و ڕێوی چاوەش و نۆکەری «دەرو دوو هۆدە» و ڕێچکەی یابەڵکیس و پوور فاتمی تێشووپڕ بە خۆراکی حەماغا... ئەو هەموو سەرکار و سەرپاڵە و شوانکارەی کە خوا نەبێ کەسیان بەسەرەوە چاودێر نەبووە... ئەو هەموو شەدەدارەی پشتێن ئەستوورەی وڵاغ قەڵەوەی سیلاح تەیارەی پێ پڕ بکرێتەوە و پێشیەوە دیار نەبێ لێی لادراوە یان شاردراوەتەوە یان وەپاش خراوە ئنجا حیسابی دەست و دیاری بۆ خزم و دۆست و دۆستی خزم و خزمێ دۆست و دۆستی دۆست و خزمی خزم بکە کە نە سەری دیاربوو نە بن... ماڵێکی بەربەڕەڵڵای ورگ دڕاوی بێ حیساب و کیتاب کە ئەو خەڵقە وەکوو مێروو کێشەی لێ کردووە و پچرانەوەی نەبووە. کێشەی ئەمانە وەستا بێ نۆرەی فەقیر هاتووە، ئەمانە ئێشیان دیترا بێ فەقێی مزگەوتەکان.. بەدوا ئەوانەوە ماڵ و مێوان... لەناو ماڵەکەیدا هەریەکێک لەو ژوورانەی خێزانێکی یان کیژێکی خۆی بە مێردەوە تێیدا ژیا بێ لۆقنتەیەکی سەربەخۆ بووە... تفاقی ساڵانە لە دانەوێڵە و قاوورمە و نان و خۆراک کە لەماڵی حەماغادا کراوە شێوەی ئۆردوگای پێوە بووە لەبەر زۆری و لە هەمە چەشنەیی. ساوار کوڵاندنیان بەهی ناو حیکایەتان دەچوو. من خۆم لە فەتاحاغای عەولاغام بیستووە، کە زاوای حاجی مەلاعەبدوڵڵا و حەماغاش بووە و لە خۆڕایی قسەی نەدەکرد، شتی وەهای لە بێ حیسابی و لە بەرەکەتی ماڵی حەماغا گێڕاوەتەوە ڕێ بەخۆم نادەم دووبارەی بکەمەوە نەوەک شتێکی لەو ڕۆژگارەدا بە عادەتی حیساب کرابێ و لەسەر کەس بە کەمایەتی دانەندرابێ، ئەمرۆکە ناوێکی دیکەی لێ بندرێ...
مەسەلەی «بەرەکەت» یش لە سەردەمی ئێستاکەدا تێ ناخوێندرێتەوە و بە ئەفسانەیی دادەندرێ کەچی جاران باوەڕی پێدەکرا هەرچەند دەشێ

ماکەکەی «بەرەکەت» لە بنەڕەتدا دیاردەی مادی بوو‌بێت، بەڵام بێگومان ئەو ماکە لە هەندێ کەسدا دەری دەداو لە هەندێ کەسیشدا بەپێچەوانەوە... کە بێم بەراووردی بەرەکەتی مەڕوماڵی حەماغا بکەم عەیارەم بەدەستەوەیە لە بڕەمەڕێکی کە دەوری 30 ساڵێک بۆ ماڵی ئێمە لای ئەم و ئەو بە دۆخۆر و بە شوانکارە درا. لەساڵی 1962 کە ناچاربووم فرۆشتمن ژمارەیان کەمتر بوو لەژمارەی ئەو ڕۆژەیان کە تێیدا بە خاوەن کران. ئێمە لەو ماوەیەدا هەرگیزا و هەرگیز دەستمان بۆ سەری یەک مەڕ درێژ نەکرد کە بە «سەرمایە» حیساب دەکرا، چی بۆ دابەستە یاخود دیاری زەڕ کرابێ لە کۆزی نوێی مەڕەکان بووە. بەڵێ دەزانم کابرای دۆخۆر وەیا شوانکارە نائەمینی لەگەڵدا کردووین بەڵام ئەو نائەمینییە بە زیادەوە لە مەڕی حەماغادا کراوە کەچی بێداد لە زیادکردندا بووە. کوێخا حەوێز دەڵێ کەس نازانی مەڕی حەماغا بە چەند لادا دەدزرا و دەخورا و دەبەخشرا و دەفرۆشرا کەچی وەک کوردی دەڵێ کونی تێ نەدەبوو. ڕێکەوتێکی سەیر و سەمەرە لەوەدا بووە کە مێگەلەکانی حەماغا بە هەزاران هەزار ژمارەیانەوە هەموو مەودای نێوان کۆیە و قەندیلی بە هاتوچۆ ساڵانە دوو جار کوتاوەتەوە و مەڕداری عەشیرەتی کەمتەرخەم لەلایەن ئایینەوە کە دەگوترێ بەراز بە پێستەوە دەخۆن بەدوویان کەوتووە و کۆزی هەڵگرتوونەتەوە و خورییەکەی بڕیوەتەوە و ڕۆن و پەنیری لێگرتۆتەوە و پشکی حەماغای لێ دیاری کردووە تا ئەگەر شتێکیشی لێ پەنا دابێت ئەوەی بە حەماغا گەییشتووە لە زۆر زۆرتربووە، کۆزی مەڕیش ساڵە و ساڵ لە زیادکردن و گەشەکردندا بووە، کەچی بڕە مەڕێکی 100 یان 150 سەری پیاوێکی وەکوو مەلای گەورە کە دراو خڕیدەی ماڵی حەلاڵی خۆی بووەو تەسلیم بە فەلاحی ناسیاوی دۆستی نوێژکەری ڕۆژوو گرتووی پشتاوپشتی متمانە پێکردن و دەسخاوێنی کراوە کەچی نەشیا و نەکرا و نەبوو ئەو 150 سەرە نەبێتە 120 یان بەرەژێرتر، خۆ گەرمێن و کوێستانیشی نەکردووە دز بردبێتی یاخود گورگ خواردبێتی یاخود لە ڕێگەو لاڕێگە هەڵدێرابێ. بەخت و تالع بۆی

هەبێت و نەبێت، بێگومان ئەگەر بمەوێت مەرِم لە کەمکردن نەبیَ دەیخەمە پاڵ مێگەلی یەکێکی وەکوو حەماغا کە ناو و شۆرەتی بەختیاری بەدواوە بیَ، ئنجا عیلم و مەنتیق بۆ خۆی چ دەفەرمویَ با بفەرمویَ.

خولاسە بەخشندەیی حەماغا لەساڵی گرانیەکەدا ژوورووی هەموو لێکدانەوە بووە. ئەگەر بەخشینەکەی بەپارە فرۆشتبایە یاخود بە مڵک و ماڵی دابایە سەدان خانووی ئەو دەمەی پێدەکرِی لەو خەڵقەی کە زۆریان بەهەمەحاڵ گیانیان لەبرسان سپارد، خانوەکانیشیان بەدوا خۆیاندا کاول بوون. لە تای تەرازووی پیاوەتیدا بێگومان بەخشینی بێمزە قورستر هەڵدەستێتەوە و پتر دەنیشێتە دڵانەوە، بەڵام ئەگەر مەسەلەی عاتیفە و بەخشندەیی بەلاوە بنێین حیسابێکی سەیر ڕووبەڕوومان دەبیَ. ئەگەر حەماغا لەجیاتی ئەوەی نان و پاتی خۆی بدابایە هەژاری بیَ مڵک و بیَ دەرەتان، هاتبایە مڵک و ماڵی لە خاوەن مڵک و ماڵ پیَ کرِیبایە ئەوسا ئەو خاوەنانە بەو مامڵەتە لە مردن ڕزگار دەبوون خانو و مڵکەکەشیان لەوێرانی دەپارێزرا هەرچەند حەماغایان لیَ دەبوە خاوەن، بەو پێیە هەمان ژمارەی کە لە مردن ڕزگار بوون بەو بەخشینەی کە بێمزە ڕۆیی، بە مامڵەتەکەش هەر ڕزگار دەبوون خانووەکانیش بە ئاوەدانی دەمانەوە و کۆمەڵ لێیان سوودمەند دەبوو. واتە ئەگەر لەجیاتی دووسەد کەسی بیَ ماڵ، دووسەدی بەماڵ ڕزگار بوونایە دووسەد کەسەکە و دووسەد ماڵیش پێیانەوە لەکیسەی کۆمەڵ دەمانەوە. ئەمەی لێرەدا دەیڵێم حیسابی کۆمپیووتەرە سارد و سرِەکەیە کە زەرەر و قازانج لێک دەداتەوە بیَ ئەوەی گویَ بداتە خورپەی هەناو و کزەی دڵ و ئەسرینی چاوان، و بیَ ئەوەی فەرق بکا لەنێوان دۆست و دوژمن وەیا کورِی خاوەن ماڵ هەڵاوێریَ لە کورِی داگیرکەر... بەهەمەحاڵ ئەم حیسابەی لێرەدا دەیکەم کەوا نە حەماغاو نە هیچ خێرخوایەکی دیکەش کردی، خۆیشم لە هەموو عومرمدا بەبیرمدا نەهاتووە، وەنیە ببرِای ببرِای بایەخی نەبوە و نابێت چونکە بارەها و جارەها مرۆی بەرپرسیار تێبینی ئەو تەرزە حیسابانەی کردووە وەک ئەوەی کە هاتووە یەک دەستە لە سەربازان بەرەو کاری

کوشندە بنێرێ گەڕاوە بەدوا سەربازی ڕەبەن تا ئەگەر لە کارەکەدا مرد هەتیوی لەدوا بەجێ نەمێنێ یاخود کەسانی وەهای هەڵبژاردوە بەدوور کەوتنەوەیان پەکی تۆپەکان و زرێلییەکانی نەکەوێ یان ئەگەر سەربازێکیان لەلێدانی تایپ ڕایتەر ماهیرتر بوو بێ ئەوەی لای خۆی گل داوەتەوە یەکێکی نامەعلانی بۆ مردن هەناردوە...

بەهەمەحاڵ چاکە و پیاوەتی بڕیاری دڵ و دەروونە، نە بەزۆرەملێ لەگەڵ خۆدا دێتە دی نە گوێش دەداتە لایەنی بەرژەوەند و زەرەر و قازانج، کەسێکیش بیەوێ لە ڕێی تێخوێندنەوەی دەوڵەتپارێزی خۆیەوە سەخاوەت بکا بە پێپلکەی سەرەژوور چوون، لە ماندووبوون و زەرەر بەولاوە نایەتە کیسەیەوە چونکە هەر ڕۆژێکی داناشی لە سەخاوەتەکەی گرتەوە لە ناو بەدی پتری بۆ نامێنێتەوە. دەبێ هەتا دوایین ترووکەی چاو لە عومریدا خەریکی بەخشینی بێمزە بێ. بابایەک کەس لێی نەزانیبێ سەخاوەتی کردووە کەس ناوی ناهینێ بەڵام ئەو ڕۆژەی بابای کیسە بەڕەڵڵا زارکی کیسەکەی دادەخات سەدویەک تۆمەتی وەپاڵ دەدرێ. لە لایەکی دیکەشەوە کابرای سەخی کە دوای گەشتی عومرێکی پڕبەخشین دنیایەکی چۆڵ بەسەر میراتگردا بەجێدەهێڵێ کەس بەتەما نییە تۆڵەی ئەو چاکەیەی بۆ بکاتەوە بەچاودێری کردنی منداڵەکانی، ئەو ڕەزیلەی کە سامانیش بۆ منداڵەکانی بەجێدەهێڵێ کەس بە خەیاڵیدا نایەت ڕوو لەو منداڵە تێر و تەسەلانە وەربگێڕێ هەر چونکە باوکیان پووڵەکی بوو شایەدیم بەحەقە، زۆرم دیتووە میراتگری مەئمووری بەرتیلخۆر سەد ئەوەندەی میراتگری مرۆی بەخشندە کە بە موفلیسی سەری نایەوە حورمەتی گیراوەو مێچکە مێچکەی لەبەردا کراوە. خولاسە ئامۆژگاری بێ لەمنەوە و لە حەقیقەتەوە، کەسێکی بیەوێ پیاوەتی لەگەڵ خەڵقدا بکات چ بەماڵ چ بەئەرک چ بەگیان چاوەنۆڕی پاداش نەبێ. وەکوو حەماغا کە بەرخەکانی بە خوافرۆشت ئەویش بە دڵە مەردەکەی خۆی و بە ئامانجە گەشەکەی و بەتێکڕای ملیۆنەهای میللەتەکەی کە هەر نایانناسێت ببەخشێت ئیتر ئەو بەخشینە چ دەبێ با

ببێ. تۆ کە لەبری چاکە چاوەنۆڕی پاداش بوویت دوو ماندوو بوونی بێبڕانەوە لەو ناوەدا خەلق دەکەیت. یەکیان ماندووبوونی خۆتە کە هەتاهەتایێ بەتەما دەبیت خەڵقیش چاکە لەگەڵ تۆدا بکات یاخود هەر نەبێ تۆڵەت بۆ بکاتەوە. ماندووبوونی دووەم هی ئەو کەسەیە کە چاکەی لەگەڵدا دەکەیت چونکە بەو چاوەڕوانیەت کابرا دەکەیت بەدیلی خۆت و بەسەریدا دەسەپێنیت کەوا تا ڕۆژی مردنی ئامادەی خزمەتت بێ یان چاکە مەکە یان بەتەمای پاداش مەبە.

لە موناسەبەی باسی بەخت و تالع کە گوتم حەماغا تالعی یار بووە تێبینی ئەوە دێتە پێش کە حەماغا پیاوێکی قسە نارەوان بووە و زۆر لەسەرەخۆ مەبەستی دڵی خۆی دەربڕیوە. بەزۆری وشەی «هەرامە»ی کردۆتە پاڵپشتی قسەکانی بۆ ئەوەی لە پەنا ئەو وشەیەدا بتوانێ ئارەزوی دەروونی بداتەوە بە زمانی. جارێکیان لەگەڵ حاجی ئەسعەداغای حەوێزی دەکەوێتە وتووێژی ڕاز و گلەیی. حاجی ئەسعەداغا پیاوێکی ڕەوانبێژی بەزار و کار بووە، حەماغا پێی دەڵێ، ئەمن بەقسان بەتوو ناوێرم. هەتا دەڵێم هەرامە هەرامە ئەتوو لە هەموو حیسابان دەبیەوە. لە سەردەمی ژیانی حەماغادا سەید ئەحمەدی خانەقا فەرموو بووی، حەماغا بە پیاوی خۆی دەڵێ ئەرێ هەرامە ئەو هەرامەم لە بۆ هەرامە بکە، کابرا بەدڵی ئەو ئیشەکە ڕادەپەڕێنێ، کەچی من بە قسەزان ناسراوم، دێم بە وردی پیاوی خۆم تێدەگەیەنم ئنجا هەرچی پێم گوتوە وەها ناکات. بەڵام پێویستە بزانین کە ئەو نارەوانییەی لێ نەبۆتە عەیب بگرە لێی شیرن هاتووە.

شەخسییەتی حەماغا لە دڵاندا ڕەنگی بە بێدەنگی و زمان کپییەوە گرتووە، چ دەستوقامی چەک و سواری بووبێت و چ بەخشندەیی و بەهانا هاتنی خەڵق بووبێت و چ جۆرەها مەردایەتی بووبێت هەمووی بەخامۆشی و بێدەنگ و هەرا و بێ خۆهەڵدانەوە بووە. بێدەنگییەکەی لەگەڵ ڕەووشت و خووی کە لێی زانراوە بۆی بووە بە وەقارێک خەڵقەکە لێی سەڵمێتەوە. ئەگەر پیاوێکی زارقەرەباڵغ و قسە لەسەر یەک بووایە بەشێکی گەورەی شەخسییەتی لەگەڵ

بای قسان دەچووە هیچە. هەموو کەس زانیوەتی حەماغا پیاوێکی باڵقووڵی بێدەنگ و هەرا و لەسەرەخۆ بووە، هەتا دەنگی دەرنەبڕیوە هەر کارێکی ڕوویدابێ جێی بەخشین و چاوپۆشی و لێبووردن بووە، بەڵام کە دوو لێوەی لەبڕیارێک بزاوێتی و قسەی لە زارەوە دەرچووبێ پەشیمان بوونەوەی نەبوە. دڵە هوشیارەکەی حەماغا لەدەمی بێدەنگیدا لێکدانەوەی دەروونی کردووە و سەروبەری کار و بەرژەوەندی پێکدی گرتوون، لە جیاتی ئەوەی بەقسەی لووس و چەورەوە خەریک بێ بەخامۆشی دنیای دەوروبەری خۆی هەڵسەنگاندووە و بە تەرازووی فکری خۆی ئەو خەڵقەی هەڵکێشاوە و سەنگی بۆ داناون و بەو پێیە ڕەفتاری لەگەڵدا کردوون و کەم وەها بووە لێیان بەسەهوو چووبێ. ئەو مەزنە پیاوە لە خەسڵەتی بێدەنگیدا هەم ماوەی بەخەڵق داوە لەسەرەخۆ ڕەفتار بکەن هەم ماوەی بە خۆیشی داوە پەلە نەکا لە گەیاندنە جێی ئارەزوکانی یان بڕیارەکانی. دەڵێن زمان بەڵای سەرە، ڕاستییەکەی هەتا مرۆڤ بەدەسەڵاتتر بێ پێویستی بە زمانی ئارامتر و بێهەڵپەترە. مرۆی بێدەسەڵات و کەمبڕشت بە زار قەرەباڵغی و هەرا و هۆریاکەیدا هەر شەپەشەپی شەویلکانی لەکیس دەچێ، کەچی خاوەن دەسەڵات لەوانەیە بەدوو وشە وڵاتێک ئاوەدان و وڵاتێک کاوول بکات.

بێدەنگی کە دروشم و شەقڵی شەخسییەتی حەماغا بووە پتر لەلایەن خەڵقەوە حیسابی بۆ کراوە تا ئەوەی حیسابی نەڕاندن و هەڕوگیف بۆ ئاغایەکی دیکە کرابێ. خەڵق پتر کۆمەی لە بێدەنگی حەماغا کردووە و ئاگاداری دەست و زمانی خۆیان بوون لەئاست ئەو بێدەنگییەدا چونکە زانیویانە دڵیکی نەنووستوو لەناو ئەو سینە فەڕاحەدا بە هۆشیاری و بەچاوی کراوەوە لێ دەدات.

خوێنەری کوردا
چی لەم ڕووپەڕانەدا دەیخوێنیتەوە لەبارەی حەماغاوە لوێچی خروارێکە.

بەداخەوە بەشی هەرە زۆری پیاوەتی و سەخاوەتی حەماغا بەمردنی کەسانی هاودەوری خۆی لەبیسەران دابڕاو بوو بە نەقشی سەر ئاو، چی ماوەتەوە لە ئەخبار و شوێنەواری مەردایەتیە زلەکەی وەکوو دەنگی شەپۆلی دەریایە کە لە دوورەوە شایەدی بۆ هەبوونی دەریا دەدات. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر بێین ئەو خەبەرانەی لێی بەجێماون بەسەر پیاوماقووڵانیاندا دارەبەخش بکەین و بۆ ئەوانی بەماڵ دابنێین ژمارەیەکی زۆر لەو پیاوانە بەو خەبەرانە دەبنە میرخاس و ناوی پیاوەتیان دەنگ دەداتەوە.

چەند کەسمان پێ شک دێت لەهەموو عومری مێگەلە مەڕێکی بەخشی بێ بەو شوانەی بەر لەچەندین ساڵ بۆی بەخێو کردووە؟

چەند کەس لەگرانیدا جەڵەبە کاوورِی بەخوا فرۆشتووە؟

چەند خاوەن دەسەڵات و سامان دوای برِانی دەغڵودانی خۆی کاروانی ناردووە بۆ هەندەران دەغڵی پێ بهێنێتە ئاواییەکی خۆی برسییەکانی پێ تێر بکات؟

چەند کەسی لەخواترساو دەستی پاراستووە لەوەی مڵکایەتی 32 دێ بە 320 لیرە بکرِێت؟

کێ هەبوە 250 لیرە بۆ ئافرەتێکی ڕووتکراو دابنێ لەبری ئەو ماڵەی جەردە لێی ستاندووە هەر چونکە ڕێگریەکە لە نزیک نشیمەنی ئەودا کراوە؟

ڕاستییەکەی ئاکار و کردار و ڕەفتاری حەماغا بەهی داستانان دەچێ، ئەگەر لەشایەدی ڕاستگۆوە خەبەریان بە ئێمە نەگەییشتبایە لێیان دەکەوتینە گومانەوە، بەتایبەتی لەڕووی ئەو حەقیقەتە زلەوە کە شەخسییەتی حەماغا لەهەموو مەیدانەکانی پیاوەتیدا پێشڕۆ بووە نەک هەر لە ماڵبەخشین و لێ بووردن.

لە بەرنامەمدا بوو، دوای لێ بوونەوە لەم نووسینە هەناسە کورتە، بیرورِای خاوەن بیرورِای کورد وەربگرم لە بارەی حەماغاوە ئایا چۆن پیاوێک بووە و

چۆناوچۆنی باسی کراوە، تەنانەت لە سەرەتای ئەم نیازەمدا ڕۆژێکیان لە کۆیەوە بۆ هەرێمی ڕانیە چووم و سەردانی حاجی شێخ حوسێن حاجی سەیدم کرد لە بۆ سکێن و لێم پرسی حەماغای بەلاوە چەندوچۆنە. لە وەڵامدا گوتی پیاوێکی لە خواترساوی خاوەن بەخشینی ئازای بەوەفا بووە کە ناوی بەهەموو کوردستاندا بەوجۆرە بڵاو بۆتەوە و کەسیش بەدڵیدا نایەت ئینکاری لەو ڕاستییە بکات. دوای ئەمە بە ئانقەست ناوناوە باسێکی لابەلایی حەماغام دەهێنا ناوەوە بێ ئەوە پرسیاری بەدوادا بهێنم، چی لەو خەڵقەم دەبیست هەمووی مەدح و سەنا دەردەچوو. لەوەوە هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە شایەدگرتنم لەو خەڵقە بۆ مەردایەتی حەماغا شتێکی بێلزومە، ڕەنگە لە مەعنادا بە زەرەریش بگەڕێتەوە چونکە وەک بڵێی مەسەلەکە حەوجە بە شایەدی بێ، لە حاڵێکدا پیاوەتی حەماغا وەکوو مانگ وەهایە کە هەڵات حەوجە بە ئەنگوست نییە.

لە بەراوورددا شەخسییەتی لێ سەلمێندراوی حەماغا دەچێتە ڕیزی شەخسییەتی حاجی بەکراغا کە ئەویش لەسەردەمی خۆیدا قسە لە قسەیدا نەکراوە. بەڵێ مەیدانیان جودا بووە، هەریەکەیان شەقڵی تایبەت بەخۆی هەبوە لەناو و شۆرەتدا بەڵام لە ڕووی حورمەتی بێپایان و قسەڕەوایی و شکۆ و ئیعتیبارەوە هەردوویان یەکەتازی دەورانی خۆیان بوون. ڕاستییەکەی زینەتی کۆیی لەو سەردەمانەدا بەهەمە جۆری و هەمە چەشنی کەڵەمێردەکانی بووە. کۆڕی شیعر و ئەدەب و ئاهەنگ لە دیوەخانەی حاجی بەکراغا و ئەمیناغا، غەڵبەی عەشیرەت و مێوان و سوارێنی لە دیوەخانەی مەحمووداغا، دەرس و دەوری پازدەبیست مەدرەسەی فەقێیان لەلایەکەوەو زیکرو فکری چەندین تەکیە و خانەقا لەلایەکی دیکەوە، بازاڕی بە هەڕمێنی توجار و سنعەتساز و کاسبکار بە چالاکی و کاڵای نەخشیینانەوە، ڕەپەی کاروانی چوارگۆشەی وڵات ڕووە و شار بە مێوانی، شەقەیناڵ و زرەی قۆرادەی قافڵەی بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا و هەموو کەنارێک... ئەگەر تۆقی لەعنەتی بێگانە بینەقاقای شارەکەی نەگرتبایە و جەنگ و گرانی بە ئەژنۆیدا

نەهێنایە شێخ ڕەزا گوتەنی کۆیەی ئەو سەردەمانە لێی بەڕاست دەگەڕا بگوترێ:

گەر فەلەک لێی بگەڕێ مەنبەعی عەیش و تەڕەبە

لێرەشدا قسەمان کۆیە بە شاری دراوسێی خۆی دەگرێت نەک پارس و لەندەن.

خۆشبەختانە کۆیە و دانیشتوانی لەو دوو کەڵەمێردە دەسەڵاتدارە بەهرەوەر بوون و پێیانەوە حەسابوونەوە چونکە هەر دوویان لەخواترساو و کاسب و خزمەتگوزار بوون. لە نێوان دوو بنەماڵەی حەویزی و غەفووریياندا ناکۆکی هەبوە بەڵام لەسەردەمی ئەم دوو مرۆیەدا، مەگەر بە شێوەیەکی پەنامەکی کە ئەوانی تێدا ئاگادار نەبووبن، دەسدرێژییان لەیەکدی نەکردووە. حورمەتی بێ پایانی حاجی بەکراغا بۆ ئەميناغاش بەردەوام بوو هەرچەند لەئاکامی دابەشبوونی دارایی حاجی بەکراغا بەسەر میراتگراندا ئەميناغا دووچاری سەغڵەتیش بوو تا ئەوەی دەگێڕنەوە ناوناوە، بەدەست ناگزوورییەوە یەخەی حاجی ئەسعەداغای برای خۆی دەگرت و کۆنە قەرزێکی لێ داوا دەکردەوە کەوا هەرگیز وجودی نەبووە، حاجی ئەسعەداغایش بەڵێ بەچاوانی گوتووەو قەرزە مەوهوومەکەی بە براگەورەی داوەتەوە. جگە لە دابەشبوونی میرات، ئەميناغا خۆیشی دەستبڵاو بووەو لەبەر نازی کە بەمنداڵی پێی دراوە کەمتریش بە کەسابەتەوە خەریک بووە، مەسرەفی دیوەخانەشی ڕەنگە بەپێی سەردەم لەچاو ڕۆژگاری حاجی بەکراغا لەزیاد بووندا بووبێ...

ئەميناغا کە هاوچاخی حەماغا بوو بابایەک نەبوو خەریکی دوژمنایەتی و ڕق هەڵگرتن و تەپکە بۆ ناحەز نانەوە بووبێ. شاعیرێکی بەناز پەروەردە کراوی دڵتەڕی دڵناسک و یارانی بووە لەهەموو کەسێکیشەوە حورمەتی دیتووە تەنانەت کە لەتەمەنی پەنجاساڵیدا، لە 1305 ک، بوو بە مێوانی خاک تازیەیەکی بۆ گەڕا نەبیستراوە لە کۆیێ بۆ کەس گەڕابێ دواتریش وێنەی نەدیتراوە. ناکۆکی نێوان حەوێزی و غەفووری دوای مەرگی ئەميناغا سەری

هەڵدایەوە ڕێشم نییە بەبەر ئەو حیکایەتەوە بنیشم نەکا بێلزوم دڵی ئەم و ئەو بیەشێنم. بەهەمەحاڵ ناکۆکییەکە لە دەوری حەماغادا مام سەلامەتۆکە بووە، دوای ئەو و دوای حاجی ئەسعەداغا لەسەردەمی مەلا حەوێزاغای حەسەناغای غەفووری و جەلالاغای حاجی ئەسعەداغای حەوێزی ناکۆکییەکە ڕووی لە دڕی و سووتاندن و وێرانی کرد. بە ڕێکەوت هەر دووکیان لە دوو ڕووداوی جودادا قاچیان زەدە بوو. تا ڕادەیەک تۆڵەی سەپان و ڕەنجبەری بێتاوانی خەرمان سووتێنراویان بەو شەلییەیان لێ ستێینراوە. دواییش زەمانە گەپی خۆی بەلای خۆشیدا شکاندەوە و کوڕی مەلا حەوێزاغای کرد بە زاوای کوڕی جەلالاغا.

خوا لە مردووان خۆش بێ و هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕی حەماغا.

بەتەما بووم درەختی خانەوادەیی غەفوورییان لە غەفووراغاوە هەتا حەماغا سەرەژێر بهێنم و لێی گەرێم. بەڵام تەکلیفی کاکەزیاد ئەوە بوو درەختەکە بەلک و پۆپی هەموو بەرە بابەکانەوە بۆ ئەم ڕۆژگارە دەور بکرێتەوە. منیش ڕووی تەکلیفم لە کاک حاجی محەیدین نا، ئەویش لەگەڵ خزمانی شارەزای غەفووری دەفتەری سەرلەبەری نێرەوەزی غەفوورییانی بۆ گرتمەوە منیش پەنا بەخوا لەدەست هەڵە و زەللە، بەوشێوەیەی کە بشێ لەچاپ بدرێت و کرێکاری چاپخانە تێیدا بەسەهوو نەچێت پێبەپێ لە غەفووراغاوە بەرەخوار دێم تا دوا دڵۆپی ئەو تاڤگەیە کەوا، ماشەڵڵا لەبرشت و بەرەکەتی، هەردەبێ سەڵەواتی بۆ لێبدەیت. ئادەمیزاد بەو پێیە زیاد بکات پەنجاساڵی دیکە نابا لە برسان دەمرێ.

لەکۆتایی ئەو تێبینییانەدا دەگەڕێمەوە بۆ باسێکی کورتیلەی سەر بەتەقیەدین پاشا کە گوتم بۆ تەنبێ کردنی هەمزاغای مەنگوڕ و سەرکوتکردنی غەفوورییان لەبەغداوە بە سپاوە هات و ئەوەی کرد کە کردی.

حاجی مەلا ئەسعەدی جلیزادە، باپیری باوکم، لە پەڕەیەکی کتێبی «فتاوی ابن حجر» کە لەلایەن عەبدوڕڕەحمان سابڵاغی و عەبدولقادر هالەیی وە لە 1266ک. بۆ حاجی مەلا ئەسعەدی مامۆستایان نووسیوە، بە خەتی خۆی ئەمەی نووسیوە «طلع تقی الدین پاشا الی اصلاح ما أفسده همزه اغا المنگور من یوم الجمعة من خارج کوی متوجها الی رانیه اخر صفر سنة 1284 هجری».

لە خەبەراتی خانەوادەییمانەوە دەزانین، تەقیەدین پاشا و حاجی مەلائەسعەد لەو ڕێکەوتەدا سەردانی یەکدی دەکەن، ئنجا نازانم کامیان زووتر سەری ئەوەی دیکە دەدات لەو دیدەنیانەدا تەقیەدین – پاشا گفتوگۆیەکی خۆشکەڵەی لەگەڵ باپیرم، حاجی مەلاعەبدوڵڵا کە ئەوسا جارێ حەجی نەکردبوو، دەبێت بەدەقی خۆیەوە لای ئێمە پارێزراوە و بەهۆی گفتوگۆکەوە حاجی مەلائەسعەد وەکوو بانگهێشتن بێ، چەند مەنجەڵە دۆڵمەی گەڵامێو بۆ بارەگای تەقیەدین پاشا دەنێرێ. ئەم پێوەندییە لە سەرەتای هاتنی تەقیەدین پاشا بووە هۆی ئەوەی کە دوای گەڕانەوەی لە دەسگیرکردنی هەمزاغا بۆ کۆیە و شەڕە خوێناوییەکەی لەگەڵ غەفوورییاندا، حاجی کاکەسعەد چووە ڕجاکاری بۆ وەرگرتنەوەی کەللەی سمایلاغای غەفووری کە لە شەڕەکەی میرسەیددا کوژرابوو و کەللەشی لە حەوشی سەرای کۆیێ چەند ڕۆژان بەدارەوە بوو یان فرێ درابوو.

گفتوگۆکەی باپیرم لەگەڵ تەقیەدین پاشادا پێوەندی بەباسی غەفوورییانەوە نییە و لایەنی نوکتە و لەتیفەی پێوەبووە، لزومم نەدیت لێرەدا بۆ خوێنەری بگێڕمەوە.

هەروا بەدوا باسی گیرانی حەماغادا ڕووداوێکی کورتیلە داوام لێدەکا فەرامۆش نەکرێ. حەماغاو ڕەسووڵاغای ئامۆزای و یەکێکی دیکەش لە پیاوماقووڵانی غەفووری بەحەبسی لەکۆیەوە بۆ کەرکووک بەڕێ دەکرێن. حاجی ئاغاموستەفا کە لە بنەماڵەیەکی کۆیە بوو و دۆستی حەماغا بووە

بەگەڵ حەبسەکان دەکەوێ نەکا لەڕێگادا پێویستییان بە ناسیاو هەبێ. لە تەقتەق ڕەسوولاغا بۆی ڕێک دەکەوێت، ئیتر بە هیممەت یان بە قیمەت، خۆ ڕزگار دەکات و هەڵدێت.

کابرای عەسکەری تورک کە بەرپرسی حەبسەکانە دەبینێ یەکێکیان کەم بۆتەوە ئەویش لەجیاتی ئەو ژمارەیە حاجی ئاغا موستەفا دەخاتە بەندەوەو دەڵێ، ئەمن سێ کەسم تەسلیم کراوە ئەمەش سێ کەسەکە هەقیشم نییە بەسەر ناویەوە.

خولاسە ئاغاموستەفا هەتا کەرکووک و ماوەیەکیش لە کەرکووک حەبس دەبێ ئنجا بە ڕەجاو تەکلیف و سۆراغ دەسەلمێنن کە ئەمیان هیچی لە هیچدا نییە و بەری دەدەن.

**درەختیی بنەماڵەی غەفووری**

1








کەریم اغای حەمەد اغای کەریم اغای غەفوور اغا
ڕەسوڵ اغا
??
حەمەد اغا
سەعید اغا
عبداللهاغا
کەریم اغا
عومەر اغا
حەمەعەلی اغا
عثمان اغا
ئەسعەد اغا


کاکەڵڵا اغای غەفوور اغا
ئەبابەکر اغا
حاجی فەتاح اغا
سلێمان
حاجی محی الدین
مصطفی اغا
ئەمین اغا
ئەفەندی
مەلا موسی
مەلا شمس
مامەڕەزاق
صادق اغا

- سلێمان اغای حاجی فەتاح اغا
  - مەلا ئەحمەد اغا
  - واحد اغا
  - نەجیم اغا
  - حەمەد اغا
  - مەجید اغا
  - حەمید اغا
  - جەلیل اغا
  - محسن اغا
  - حاجی عبدالرحمان اغا


حاجی محیالدین حاجی فتاح اغا
مام ئەسعەد
محی الدین اغا
سعدی اغا
حاجی حەمەسەعید
ڕەفیق اغا
فاضل
کاظم
تەحسین


مامەڕەزاقی حاجی فتاح اغا
حمد
علی
ظاهر
اغا


صادق اغای حاجی فتاح اغا
جبار اغا
سلیم اغا
ڕەئووف اغا
صابر اغا







3

ئاوڕەحمان اغای غەفوور اغا داوود اغایەکی لێ بەجێ ماوە بە تاعوون مردووە


غەفووری برایماغا
قاسم
قادر
فاروق
ئەمین
کاکەجاف
یاسین
برایم
معروف
ڕەسووڵ


حەوێزی برایم اغا
تەها
غەفوور
نادر
فتح الله
کەریم
عبدالله
سمایل
علی
مولود
اغا ساکنی
نازەنین بووە
خالد
سعید
نالید
ڕەفیق
تۆفیق

5



مەلا دەروێش کوڕی غەفووراغا
حاجی مصطفی
مەلا دەروێش
طاهراغا
ئۆمەراغا
حمد مصطفی
احمد
عومەر
رشید
وونس خان
بایز
حەمەخان
خورشید
توفیق
فارس
ئاغەلە
برایم
فتح اللااغا


عەلی اغای
فەقێ)
عەلی اغا
مام فەقێ
مام قادر
مام ئەحمەد
مام نادر
حمید
مەغدید
رشید
فتاح
عبدالرزاق
شوان
کەریم
صمد

6

بەمەدا درەختی خانەوادەی غەفووری کە سەرەتاوە بوونەتە شەش بەرەباب کۆتایی دێت، بەڵام دەبێ تێبینی ئەوە بکرێ کە کچانیان باس نەکراون...

زۆریش لەو کچانە شوویان بە خزمی خۆیان کردۆتەوە کە ئیتر ناچنە سەر حیسابی بنەماڵەی بێگانە. جگە لەمە هەرە دوایینی ئەو عالەموڵڵایە کە هێندێکیان بوون بە خاوەن ماڵ و منداڵ و هێندێکیشان لە پلەی خوێندنی خواروو و ژووردان و هی ناو بێشکەشیان زۆرە. ئا ئەمانەش بەر حیساب نەکەوتوون. لە بەراووردێکی سەرپێیی بۆم ڕوون دەبێت کە زاوزێی ئەم بنەماڵەیە لەگەڵ فەلاکەتی کوشندەی ساڵی 1237 و 1284 ک. ژمارەیان لە سێ هێندەی بنەماڵەی جەلیزادە تێپەڕ دەکات لە حاڵێکدا باپیرە گەورەی جەلیزادەی کۆیێ «مەلاعەبدوڕڕەحمانی کاکی جەلی» کە لە 1217 ک. مردووە هاوچەرخی غەفووراغا بووە، بگرە کمێکیش لەو کۆنتر بووە ئێستاکە غەفووری دانیشتووی کۆیێ پترن لەسەرلەبەری جەلیزادان.

لەچەندین دێی ڕانیە و کۆیە و شەقڵاوەش خاوەنماڵە و مڵکی غەفووری هەن. یاخوا پتریش بەرەکەتیان تێ بکەوێ. کوردەواری زێدە هەیە بە پڕکردنەوە و تێهێنانەوەی کەلێنی کردووان.

لە نموونەی بەر حیساب نەکەوتنی چینەکانی دوایی غەفوورییان دەڵێم قادراغای سمایلاغا کە برازای حەماغایە تاکێک لە کوڕانی بەر ژمار نەکەوتوون. سمایلاغا و حەمەدەميناغای مەلا ئەحمەداغا کوڕ و نەوەیان نەهاتووە. هەروەهاش مەلا حەوێزاغا و جەلالاغای حەسەناغا نە کوڕ نە نەوە نە کوڕی نەوەیان باسیان کراوە... چەندین کەسی دیکەش دەناسم لە غەفوورییان ناوی خۆیان و وەچەیان نەهاتووە. ماشەڵڵایان لەسەربێ.

لە نووسینەکەم بوومەوە ئەوجار خاڵەکانی خوارەوە دەرنەزەر کران.

نەمویست دەست ببەمەوە بۆ نووسینەکە چونکە دەبوو سەرلەنوێ بەگوڕین و بە لێ زیاد کردن پرۆڤە چاپکراوەکان هەڵوەشێنەوە. باشتر ئەوە بوو لە چەند دێڕێکدا ئەو خاڵانە بخرێنە کۆتایی سەرلەبەری

1- هەروەک لەسەرینایی دەستگیربوون و زامداربوونی حەماغا لە هەرای میرسەید بە هۆی پرچ و کاکۆڵ. پرچ و کاکۆڵ بەلای غەفوورییانەوە ناحەز بوو هەروەهاش لە سەرینایی قەتلوعامی غەفوورییان لە جەژنی ڕەمەزانی ساڵی 1237 ک. پڵاو برنج لە دوو جەژنی ڕەمەزان و قورباندا لای غەفوورییان هەڵگیرا. لەو دەمەوە تا ئێستاش غەفووری لەو دوو جەژنەدا پڵاو ساوار لێ دەنێن.

2- چی نووسیوەتم لە بارەی موژدە بردنی مەرگی حاجی ئەسعەداغاوە بۆ حەسەناغای غەفووری و سزادانی موژدەبەر بەخستنە ناو ئاویەوە لە ڕیوایەتی مەشوورتردا دەدرێتەوە بە مەرگی حاجی بەکراغا «باوکی حاجی ئەسعەداغا». هەندێک دەڵێن موژدە بۆ کەریماغای غەفووری چووە. هەندێکیش دەڵێن موژدە بۆ سمایلاغای برای کەریماغا چووە، لە هەموو ڕیوایەتانیشدا پاداشی موژدەبەر چوونە ناو ئاوە. دەلالەتی ڕووداوەکە بە گۆڕانی «کەس» ناگۆڕێ.

3- لەبارەی «بۆڵشەفیک» ە کانی کۆیەوە کە گوتم پێشتر هیچم لە بارەیانەوە نەبیستبوو کاک مەجیدی مامە نوورەددینم گوتی، لە حەمەعەلیاغای مەشوور بە «عەلی غەربی- خوارزای باوکم بوو»م بیست کە لە دەمی بۆمباردمانەکەی ئینگلیزان خەڵقی کۆیە بۆ دێیەکان بڵاوەی لێ دەکەن. حەمەعەلیاغا گەیشبوە کاروانێک لەمانە پەشۆکاوییان پێوە دییار

بووه. گوتبوویان ڕێگر خەریک بوون ڕووتمان بکەنەوە بۆلشەفیکەکانمان پێ ڕاگەییشتن و بەشەڕ لەگەڵ ڕێگران ڕزگاریان کردین ئەم ڕیوایەتە شایەدیەکی بێگومان و بەهێزە بۆ ئەو بۆلشەفیکانە.

مەسەلەی »جەڵەبە کاووڕ بەخوا فرۆشتن» لە هاتن و چوونی پرۆڤە لەنێوان من و چاپخانەدا پەڕیوە. لە زۆر کەس ئەو مەسەلەیە بیستراوە یەکێک لەوان «آصف آل قاسم آغا»ی مووسڵی لە بەغدا بۆ مەجلیسی گێڕابۆوە کە لە گرانیەکەی 1917 خۆی لە کۆیێ بووە، چێوەداری مووسڵی مامڵەتی برە بەرخێکی حەماغا دەکەن لەسەر نرخ پێک نایەن. سبەینە دەچنەوە لای دەڵێن بەو نرخەی دیارت کردبوو ئێمە ڕازین. حەماغا گوتبووی، ئەو بەرخانە فرۆشران. چەندێکی دەیانەوێ بزانن چۆن فرۆشران و کێ کڕینی هەر ئەوەندە دەڵێ، فرۆشراوون. ئاسەف قاسماغا دەڵێ، دەمزانی کەس نییە لەو ناوە بتوانێ جەڵەبە بەرخی وەها بکڕێ. زۆرم ئیلحاح لە حەماغا کرد هەتا پێی گوتم، لە دوێنێوە کە ڕێک کەوتن نەبوو لەسەر نرخیان بەخوام فرۆشتن. تومەز لە مامڵەتەکە بەدڵ پەشیمان دەبێتەوە و هەموو بەرخەکانی دەرخواردی برسی و ڕووتی ئەو ساڵەی قات و قڕییە دا.

وەها دییارە ئەو لاپەڕەیەی پارچە هەڵبەستی مێژووی دروستکردنی دیوەخانی مەحموداغای تێدایە، ئەویش لە هاتوچۆدا کەوتووە وا لێرەدا دەیاننووسمەوە. ساڵی 1271 کە لە کۆتایی هەڵبەستدا بە حیسابی «جمل» دەرهێنراوە ئەوە بەڕاست دەگێڕێ کە دیوەخانەکە دوای مردنی حاجی بەکراغا لە 1270 دروست کراوە مسرەعی یەکەمی بەیتی یەکەمی برە شیعرەکە تەنها ووشەی دوایینی ماوە ئەوە ئەوی دیکەی لەو بەردە مەڕمەڕەی لێی هەڵکەندراوە کەوتووە یان بابڵێن شکاوە. ئەو ووشەیە «اعلا» یە کە کە هاو قافییەی بەیتەکانە. وا لێرە بەرەژێر شیعرەکە وەکوو خۆی دەنووسمەوە :

که از وی یافت زینت روی دنیا

ازین قصر سفیدو مدح بانی

قلم هرچه نویسد نیست اغرا
ملائک آیة الکرسی بحفظش
همی خوانند از شب تا بفردا
کریم اکرام این تأریخ فرمود
«بیامد باقی ان محمود آغا»

«...»